سەرجەمی بەرھەمی عاسی

١

# دیوانی عاسی

## ١٨٨٥- ١٩٧٥

ئامادەکردن و پێشەکی و فەرھەنگۆکی

عەزیز گەردی

بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: دیوانی عاصی
ئامادەکردنی: عەزیز گەردی
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
بەرگ : أمین مخلص
نۆرە و سالی چاپ: یەکەم ١٤٢٨ك – ٢٠٠٨ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٩٤٩ ) سالی ٢٠٠٦ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

عاسیی شاعیری ناسراوی کۆیی یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکییەکانی سەدەی بیستەمان و لە شیعرەکانی دا هەموو دەستوورە باوەکانی شیعری کلاسیکی کوردی پەیڕەو کردووە و لەو چوارچێوەیەشدا تایبەتێتی خۆی پاراستووە چ لە هەڵبژاردنی وشەو دەستەواژەو ڕستەو چ لەو بابەتانەی بەشیعر مامەڵەی لەگەڵ کردوون. عاسیی شیعرەکانی، چەند دانەیەکی کەم نەبێ ئەوی تری هەمووی بە کێشی عەرووزی نووسیوەو بەزۆریش پەیڕەوی یەکێتی سەروای کردووە. لەپاڵ غەزەل و قەسیدەکانی دا، چەند پێنجینە بەندێکی نووسیوەو شیعری چەند شاعیرێکی کلاسیکی و هاوچەرخی خۆیشی کردووە بە پێنج خشتەکی. عاسی بە شیعر گوزارشتی لە ڕووداوو هەڵوێستی کۆمەڵایەتی و سیاسی کردووە. بەبۆنەی یادی حاجی قادر و پەردەلادان لەسەر پەیکەرەکەی شیعری نووسیوە، هەروەکو بەبۆنەی هاتنی نەورۆز و بەهار شیعری هەیە. جگە لەوەی کە هەندێ نامەی شیعریشی هەیە بۆ خزم و دۆست و برادەران و هەندێ جاریش گلەو گازاندەی بۆ لێپرسراوانی

ئەوسا بەرز کردۆتەوە. عاسی شیعری دڵداری (غەزەل) و شیعری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی و داشۆرین و ستایش و پیاهەڵدانی هەیە.

عاسی، باوك و باپیرانی بە بنەچەکە دەگەڕێنەوە بۆ گوندی (خرابـە)ی لای (تەقتەق)ی سەر بە قەزای کۆیە. لەوێ زەوی و زاری خۆیان هـەبووە. عاسـی لە یەکێ لە دەسنووسەکانی دا باسی باوك و باپیرانی دەکات و دەڵێ خەڵکی (خرابە) بوون و ئێـستاش مەرقـەدی مـەلا ئەبووبـەکر لەوێیـە. ئـەو مـەلا ئەبووبەکرە باپیری عاسی بووە. پاشان باسـی موڵکایـەتی زەوییـەکانی ئـەو گوندە دەکات و لە شوێنێکی تری دەستنووسەکەدا دەڵێ ئێـستاش سـەنەدی تاپۆمان هەیە بەناوی مەلا ڕەسووڵ کە باوکی ئێمەیـە. زەوییـەکیان بـەناوی داربەسەرەو زەوییەکەی تـر بـەناوی بـەری ئاشـییە و یـەکێکی تـر بـەناوی سەرکەندانە.. ئەوەش باس دەکا کە ئێستاش کۆنە ئاشێك لەوێ مـاوە پێـی دەڵێن ئاشی مەلا عەباس. پاشان باسی چەند بەراوو بـاخی هـەنجیری خۆیـان دەکا لەوێ و دەڵێ ئێستاش ماون.

عاسی لە باسی ڕەچەڵەك و بەرەبابی خـۆی بـاس دەکـا کـە خـۆی نـاوی مستەفایە و کوڕی مەلا ڕەسـووڵی کـوڕی مـەلا ئەبووبـەکری کـوڕی مـەلا عەباسی کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عوسمانی کوڕی مـەلا ئەحمـەدە و بەپێی تۆماری باری کەسێتی لە ساڵی ١٨٨٥ لەگوندی خرابە لەدایك بووە.

عاسی سەرەتا لای باوکی دەستی بەخوێندن کردووە و لـە خوێنـدن دا تـا (جامی) چووە. ماوەیەکیش لەکۆیە لای مەلای گەورە خوێندوویەتی و پاشان

چۆتە گوندی سەرگەلوو و لای مەلا ئەحمەد تاکتێبی شەرحی شەمسی خوێندووە.

لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانی، لەبەر بێ دەرامەتی وازی لە خوێندن هێناوە. ماوەیەك لە (تەلان) و (سارتکە) ژیاوە، پاشان گەڕاوەتەوە کۆیە و لە مزگەوتی قامیش لای مەلا ئەحمەد بیلاوەیی دەستی بە خوێندن کردۆتەوە. بۆ خوێندن چۆتە سلێمانی و بیارەش، بەڵام نەزانراوە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتبێ. عاسی هەرچەندە لەوەناکا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتبێ بەڵام لە زۆر شوێندا مەلایەتی کردووە وەکوو (خرابە) و (کانی کوردە) و (کانی بی) و (تەلان) و (قەمچۆغە) و (شیواشۆك) و (بانەگوڵان) و (بۆگد) و (کۆیە). لەکۆیە لە مزگەوتی گەرمکی مەیدانی خوارێ مەلایەتی کردووە. عاسی جگە لە مەلایەتی، لەکۆیە و قەڵادزێ دوکانداریشی کردووە.

عاسی دەستەپیاو بوو، نە زۆر قەڵەو و نە زۆر لاواز، نە زۆر کەڵەگەت و نە زۆر کورتەباڵا بوو، پیاوێکی نوکتەپەرداز و قسەخۆش و رووگەش و دەم بە خەندە بوو. کەواو سەڵتەی مەلایانەی لەبەر دەکرد و مەندیلی لەسەر دەناو یەمەنی سووری لەپێ دەکرد. میانەی لەگەڵ خەڵکی کۆیە خۆش بوو. سەردانی دەکردن و ئەوانیش لە مزگەوت بەخزمەتی دەگەیشتن. دۆستایەتی لەگەڵ شاعیرانی هاوچەرخی خۆی هەبوو وەکوو: عەونی و قانیع و بێخود و راجی و سافی و ئاژگەیی و...

عاسی، هەرچەندە لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەم کەوتبووە ناو ساڵانەوە، لەگەڵ ئەوەش دا چالاکانە بەشداری جم و جوولّی ئەدەبی و هونەری و رۆشنبیری شاری کۆیەی دەکرد. ئەندامی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی/ لقی کۆیە و ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر بوو.

عاسی لە تەمەنی چواردەساڵی ژنی هێناوەو دوای ساڵێك کوڕێکی لێ بووە و ناوی ناوە حەمەدەمین، هەروەها رەعنە و خەدیجە و رەسووڵیشی لێ بووە. حەمەدەمین کە گەورە بووە چۆتە بەر خوێندن و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و ماوەیەك مەلایەتی کردووەو پاشان لەبەر نەخۆشی کارکەنار بووەو عاسی باوکی لەجیاتی ئەو مەلایەتی کردووە، کە لە مزگەوتی گەرمکی مەیدانی خوارێ بووە. مامۆستا مەلا حەمەدەمینی کوڕی عاسی چەند منداڵێکی لەپاش بەجێ ماوە کە هەموویان پێ ڕاگەیشتوون و هەیانە لەژیاندا ماوەو هەشیانە چۆتە بەر دلۆڤانی خودێ. کە ئەمانەن: عوسمان و رەسووڵ و فاروق و فەیسەڵ و سەعدیە و زیبا.

عاسی لە ١٩٧٥/٩/٢٤ لەکۆیە کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی شەهیدان بەخاك سپاردراوە.

## بەرهەمەکانی عاسی:

عاسی کۆمەڵە دەستنووسێکی جۆراوجۆری لەپاش بەجێ ماوە بریتین لە سێزدە دەفتەری گەورەو بچووك و چەند لاپەڕەیەکی پەرت و بڵاو و پەرپووت، ئەم دەستنووسانە بەرهەمی جیاجیایان تێدا نووسراوە.

١- کۆمەڵە شیعرێکی زۆری کوردی و هەندێ شیعری فارسی و چەند شیعرێکی کەمی عەرەبی کە لەم دیوانەدا ئامادەکراون.

٢- وەرگێڕانی گوڵستانی شێخی سەعدی لە فارسییەوە بۆ کوردی. لە وەرگێڕانەکەدا حەکایەتەکانی بە پەخشان وەرگێڕاوەو لەکوێ سەعدی بەشیعر نووسیبێتی ئەویش هەر بەشیعر کردوویەتی بە کوردی و شیعرەکانی بە فارسی سەعدی و کوردییەکەی خۆی نووسیوە.

٣- وەرگێڕانی سێ مەکتووب لە مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ لە فارسییەوە بۆ کوردی. یەکێکان لەبارەی دەستنوێژە، دووەمیان لەبارەی هەندێ موعجیزاتی پێغەمبەرەو سێیەمیان لەبارەی ناسینی خودایە.

٤- چرای دڵان بریتییە لە (٢٢) بابەتی جۆراوجۆر. وەکوو ژیانی چەند پێغەمبەرێك: حەزرەتی یونس و حەزرەتی سلێمان و حەزرەتی جەرجیس و حەزرەتی مووسا، لەگەڵ (أصحاب الرس) و (أصحاب الکهف) و (أصحاب الاخدود) و هەندێ بابەتی وەکوو: ئەو پێنج مەخلوقەی بێ داك و باب خەڵق بوون، باب عومری چلساڵەو کوڕ عومری سەد ساڵە و ئەو چوار پێغەمبەرە

دوویان لە ئەرزن و دوویان لە ئاسمانن، لەگەڵ باسی چەند کەسایەتییەکی وەکوو: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و خەتیبی بەغدادی و عەلقەمە و ڕووداوی دوای وەفاتی حەزرەتی ئەبووبەکر.

٥- تەرجەمەی مەولانا خالید قدس الله سره العزیز، بریتییە لە ژیاننامەیەکی کورتی مەولانا بەفارسی و هەڵبژاردەیەکی شیعرە فارسییەکانی.

٦- چەند پارچە پەخشانێکی هونەری کە بەشێوازێکی ئەدەبی بەرز و ڕێك و ڕەوان لەبارەی بەهار و نەورۆز نووسیویەتی.

**عەزیز گەردی**
**هەولێر- گەڕەکی مەلایان**
**٢٠٠٥/١١/١٥**

(١)

**مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن**
**مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن**
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفوونی مەحزووف)

سەیری بکە چۆن زوڵمی ڕەقیب عومری بە بادا
جەرگی منی بەر پەنجەیی سەد جەورو جەفا دا
یا ڕەببی ڕەقیب ، هەروەکو روت ڕەش بوو لە دونیا
شەرمەندەیی مەحشەر بی لە دیوانی خودادا
وەك ئاگری بەردایە دەروونی منی بێچار
بڕوا بە جەفای ئاگری قودرەت بە هەوادا
مەحوی ستەم و حیلەیی شەیتانی لەعین بێ
سەرگەشتەوو بێ دین وشەرەف بێ لە عیبادا
لەم بەینە کە ڕشتوویە وەکوو خوێنی سیاوەحش
ئافاقی زەمین غەرقە لە گێژاوی فەسادا
وەك غارەتی شادی لە دڵم کردووە ڕۆیی
سەرمایەیی تاعاتی بفەوتێ لە عینادا
(عاصی ) بەتەمای ڕاحەت و هەم ڕازی نەجاتی
خاك بە لە دەری حەزرەتی مەحبووبی خودادا

❊ ❊ ❊

## (٢)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

دەڵێم وێڵ بم بە وەکوو دەروێش بە چۆڵ و دەشت و سەحرادا
بڕۆم وەك شێتی سەرگەشتە بە سەییاحی بە دونیادا
عەساو کەشکۆڵ وخەرقەو دەف موهەییا کەم بە یەك دەفعە
وەکوو مەجنوونی خێڵی حەی بڕۆم بە شوێنی لایلادا
لە شەرق و غەرب و بەحروبەڕ هەتا دەمرم بناڵێنم
وەکوو پەروانە عەوداڵ بم بەدوای شەمعی دڵارا دا
عەجەم تارۆم هەموو تەی کەم بە ئەحواڵی پەرێشانی
سەرم رووت کەم بکەومە دوای بە شام ومیسرو بەغدادا
مەکەن لۆمەم قرار ناکەم لە هیجرانی ئەگەر بمرم
سەرو ژوورمە لە مەوجی غەم وەکوو ماسی لە دەریادا
کوڵنگی عیشق حازر کەم لە بێستوون کەندنی دڵبەر
خەریکی وەسڵی شیرین بم لە گوڵزاری شەهنشادا
برۆ و زولف و موژەو خاڵی کە چاویان کردە سەر عەسکەر
لە بۆ عەقڵ و دڵ و دینم ئەویش ئەمری بە یەغما دا
دەنووسم دەردی دڵ ئیمڕۆ لە مەیخانەو سەراو بازاڕ
بەیانی فیکرو ئەحواڵم لە رووی عام و گەداو شادا
درۆ ناکەی ئەگەر (عاصی) سڕی عیشقت لە دڵدایە
تەفەککور کە لە رەمزی عیشق لەناو یوسف زلێخادا

* * *

## (٣)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفوونی مەحزووف)

ئــــەی پرتـــەوی چـــەهرەت لەتەماشـــایی بەســـەردا
ڕۆژێکـــی درەخـــشانە کـــە شـــەوقی بەقەمـــەردا
گـــولزاری جـــەمالی کـــە دڵـــی کردمـــە بولبـــول
بـــەو شـــێوەیی دڵ شـــیوەن و شـــین خاکـــە بـــە ســـەردا
ئـــەو دڵبـــەرە ڕەعنایـــە لـــە حوســـنا کـــە بـــەبێ شـــك
ســـەد یووســـفی میـــسری بـــە تـــەواوی لـــە کەمـــەردا
مـــن غـــەرقی خـــەیاڵم کـــە لـــە دونیـــا چـــییە نەســـلی
ئـــەو گەوهـــەرە یەکدانـــە بـــو نەمـــدی لـــە بەشـــەردا
بـــێ لوتفـــە لەگـــەڵ عاشـــقی دڵـــزارو حـــەزینی
شەســـت تـــیری فیراقـــی هەمـــەدەم وا لـــە ســـوپەردا
موشـــتاقە بـــە پابووســـی ئـــەتۆ دڵ لـــە موحـــەڕڕەم
بـــێ هوودەیـــە عـــومرێ کـــە نەفـــەوتێ لـــە ســـەفەردا
چـــەند خۆشـــە لـــە زســـتانی فـــیراق نـــەخلی مـــرادم
وەك فەســـڵی بـــەهار میـــوەیی وەســـلت بـــە ســـەمەردا
بـــێ ڕەحمـــە برینـــدارە جگـــەر خوێنـــە بـــە قوربـــان
ســـەد حەیفـــە کـــە دڵ غەرقـــە لـــە خوێنـــاوی جگـــەردا
(عاصـــی ) کـــە لـــە دەرگـــاهی ئـــەتۆ دوورە بـــە قوربـــان
بـــساوەڕ بکـــە خنکـــاوە لـــە گێـــژاوی خەتـــەردا

* * *

(٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەخزووف)

سەیری چەند بەدبەختە موفتی مەسئەلەی تەحریرەکا
مەستی مەیخانە حەقیقەت یەك بە یەك تەکفیرەکا
پێی بڵێن واز بێنی توخودا لەم نەزانی وجەهلییە
عیلمی عیشقی وەك نەدیوە سەعیی بێ تەئسیرەکا
ساقی بێنە تۆ لە رەغمی مونیکرانت بادەیێ
عاشقی دانا دەزانێ دڵ بە مەی تەعمیرەکا
دەفعەیێ مفتی بفەرموو بێرە مەیخانە ئەتۆ
وەك سلێمان پیری ئێمە ئینس و جن تەسخیرەکا
با دەبێکی پڕ شەرابی وا بەدەست بۆ عاشقان
فورسەتە خۆ بادەنۆشی حەق لە دڵ تەسویرەکا
ئیمڕۆ بەزمە وا گوڵێکی دایە بەرپێچی سەری
لەو گوڵستانە خەریکە گوڵ بەرووی تەنویرەکا
سەیری حاشیەی پەرچەمی کە گەر دەزانی دەرسی عیشق
هەستە مەست بە تا بزانی (والضحی ) تەفسیرەکا
رووکە مەیخانە بە جارێ رێی حەقیقەت وا لەوێ
جوببەوو خەرقەو عەمامە وەسلی تۆ تاخیرەکا
تالیبی بۆ گەنجی مەعنا (عاصی ) جێت مەیخانە یە
پیاڵەیی پڕ مەی بنۆشە حوکمی سەد ئیکسیرەکا

* * *

(٥)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

خودایا بەختی بەرگەشتەم لە سەرچی ئەم غەمەی هێنا
لە گولزاری جەوانیما دڵم چوو زەمزەمەی هێنا
کە چوو دوێنێ لە مەیخانە کە بەزمی ساقییانی دیت
بە عیشقی خاڵی گوڵڕەنگی خرۆش و هەمهەمەی هێنا
لە گۆشەی سینە تائێستا خەریکی کەیف و عوشرەت بوو
بە یادی وەسڵی دڵبەر چوو کە چی ئەم پەرکەمەی هێنا
لە ناکاودا ملم گرت و گوتم ئەی دڵ مەڕۆ جارێ
لە رەغما چوو لە مەیخانە رەباب وسینەمەی هێنا
شکاتی کرد لەلای دڵبەر دەکا مەنعم لە عیشقی تۆ
بە ئیمزای پیری مەیخانە کە جەلبی مەحکەمەی هێنا
لە پیاڵەی چاوی فیکریم و بەیادی وەسڵی نۆشم کرد
لە بەختی نەقسی من ساقی رەزیل بوو کەم کەمەی هێنا
کە چوومە خزمەتی ساقی بە عەزمی جوابی ئیستینتاق
ئەمن گریام لە تاوی دڵ ئەویش چوو جامی مەی هێنا
تەنافی زوڵفەکەی دانا لە سەر رێی عاشقی مەد هۆش
گوتی هاتی لە بۆ کوشتن کە تێ فکریم قەمەی هێنا
ملت کەچ کە گوتی (عاصی) تەماشای شیری ئەبرۆم کە
نیشانەی مەرگە ئەم بەزمە کە لێی دا خاتیمەی هێنا

## (٦)

مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن
مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن
(موزاریعی هەشتی ئەخرەب)

ســاقیم کــە دی لــە رەقــسا دڵــم شــتابی هێنــا
بــە یــادی جــامی چــاوی مــەیلم شــەرابی هێنــا
ئەی عاشقی خەرابات هــەنگامی کــەیف و بەزمــە
ســەرحەڵقەیی مەینۆشــان پیاڵــەی شــەرابی هێنــا
سەرخۆش و بادەنۆشم موتریب بژەن نەی وو چــەنگ
واعیــز ئــەتۆ وســکت بــە موتریــب رەبــابی هێنــا
کە چوومە ناو مەیخانە بــێ ســاقی ووشــەراب بــوو
مــوژدەی ئــەدامێ ســاقی وا پــیر جــەنابی هێنــا
ساقی بهێنــە بــۆ مــن یــەك جورعــەیی لەبالــەب
رژا شـــەرابی عەیـــشم بـــەختم خـــەرابی هێنـــا
قــازی مـــەڵێ حەرامـــە شـــەراب و بـــادە نۆشـــی
مفتــی لــە ســەر حــەلاڵی فــەتوای کیتــابی هێنــا

زاهید لە کونجی میحراب نەزان و بێ خەبەر بوو
دەرهەق بە بادەنۆشان زەجر و عیتابی هێنا
ئیمرۆ کە هاتبو وا هات بۆ خۆی ببێتە ساقی
بۆ مەجلیسی مەینۆشان مەززەو کەبابی هێنا
گەرتالیبی مەیخانەی ( عاصی ) رەباب وبادە
بۆ جەرگی پارەپارەت ساقی قولابی هێنا

❊ ❊ ❊

(١) ئەم غەزەلە لە رووی کێشەوە (موزاریعی هەشتی ئەخرەب)ە لە هەندێ لاوە لەنگی و ناتەواوی تێدایە . لە هەندێ دێردا( مفعول ) بە تەواوی نەهاتووە بۆتە (فعول) ، وەکوو دێری یەکەم وچوارەم وپێنجەم وشەشەم و حەوتەم .
هەروەها لە دێری چوارەمدا ( ناومەیخانە ) کێشەکەی تەواو نییە (کەچوومە ناو مەیخانە ) کێشەکەی لەنگە . ئەگەر بکرێ بە: ( مەیخانە چوومەناوی ... ) کێشەکەی راست دەبێتەوە .

## (٧)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

ئـەی لـەعلی دو کولْمـت لـە جـەمالت چـو سـورەبیا
شـەوقی بەچـەمەن داوە چـەمەن بۆتـە موسـەللا
وەك مـارە لەسـەر گـەنجی روخـت زولفـی سـیاهت
یاسـاغە لەبـەر حەلقـەیی ئـەو بێمـە تەماشـا
ئـەم رووحـە کـە نەقدێکـە بـە سـەد حیـشمەتی نـادەن
مەغـشووشە لـەبازاڕی عیـشق بۆتـە موقـەببا
بـاوەڕ بکـە ملیـارێ کـە فـەوتاو و ڕزیـوە
هەر سەر لەسەر ئەو عیـشقە لـە ژێـر خـاکی تەمـەننا
دڵ بۆتـە هـەدەف بـۆ سـەری پـەیکانی خـەدەنگت
دەسـترێژە لەئـەم لاوە دەکـەن غـارەتی ئـەولا
دەڕوا لـە هـەوا سـۆزی هەناسـەم لـە فیراقـت
وەك ئـاهی سـەحەرخیزە هـەتا عەرشـی موعـەللا
(عـاصی ) بە هـەوای عیـشقە مـەڵێن عارەبـە قوربـان
ئێرسـێکە بـەجێ مـاوە لـە دوای ئـادەم وحـەووا

* * *

## (٨)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

ئـــەی پرتـــەوی رەنگـــت کـــە درەخـــشانی وەڵاتـــە
لێـــوت بـــە مەســـەل چـــاهی زەنـــەخ ئـــاوی حەیاتـــە
یـــاران ئەمـــە تـــەعریفی جـــەمالی ئـــەوە دەیکـــەم
کـــوڵمی گوڵـــە چـــاوی قەدەحـــە لێـــوی نەباتـــە
وەختـــێ کـــە ســـەبا زولفـــی لـــە ســـەر کـــوڵی وەلاخـــست
عالـــەم هـــەمو هوشـــیارە دەڵـــێن قـــەدرو بەراتـــە
ئـــەی دڵبـــەری زیبـــا وەرە ئیمـــڕۆ بەتەماشـــا
چـــەند ســـەر بەتـــەمای وەســـلی ئـــەتۆ وا لەمەزاتـــە
دەی لابـــە لـــە ســـەر رۆژی جـــەمالت شـــەوی زولفـــت
رووحـــم ســـوپەری چـــاوی بـــەدو تـــیری قەزاتـــە
نەقدێکـــە لەگۆشـــەی نـــەزەرت حـــەددی نیـــسابە
روحمـــێ بکـــە ئـــەم بەندەیـــە لایـــق بـــە زەکاتـــە
بـــەو خاڵـــە لەســـەر کەعبـــەیی رووتەکـــە دەخـــۆم ســـویند
بـــاوەڕ بکـــە دائـــیم دڵـــە کـــەم مـــەیلی لەلاتـــە

ئـــەی رووگـــوڵ و پەرچـــەم رەش و ئـــەی شـــەمعی دڵارا
دڵ شـــێتە لـــە تـــاوت وەکـــو پەروانـــە لـــە دواتـــە
هـــەر چـــەندە کـــە (عاصـــی) زەدەیـــی تـــیری برۆتـــە
هیـــشتا کـــە لـــە دوای کوشـــتنی ئـــەم جـــا بەتەماتـــە

* * *

## (٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەخزووف)

دڵ لەدووریت رووحی شیرین غەرقی گێژی حەسرەتە
چاو لە رێگای چاوەنۆڕی پڕ لە تۆزی قەسوەتە
کەی دەبینم ئەی خودایە من بە چاو دووچاوی ئەو
چاوی بازە پڕلە رازە جیلوەگاهی هیممەتە
ئاوی سەرچاوەی مەحەببەت وا لە دڵما ژیایەوە
چوونی ناو گوڵزاری وەسلی موشکیلێکی زەحمەتە
چاوەکەم چاوم بەجارێ بوونە چاوەی خوێنی گەش
چونکە جەرگم وارزیوە سەیری ناکەی لەت لەتە
خۆ بە رەسمی بەندەگیمە نامەکەم واهاتەلات
جەوهەری ئیخلاسە مەعنای گەر چی خۆی بێ قیمەتە
بێ ئومیدم بۆ تەماشای خەتت و خاڵی روومەتی
پاسەوانی گوڵشەنی رووی عەسکەری سێ دەوڵەتە
زولفی رووسە پەرچەمیشی وەك فەڕەنگە بۆ هوجووم
تیپی ئەگریجەی کە چینە سەیری چەند بێ مرووەتە

رووم‌ەکــە بــازاڕی عیــشقی کــەلکی مــوفلیس نــاگرێ
چــونکە بــێ مایــە لەوێــدا موبتــەلای ســەد نەگبەیــە
عاشــقی ڕێبــازی راســتە بــۆ ویــسالی حــەق یــەقین
ژیان لەگەڵ عیشقا کــە نــەڕوا بــۆ موســلمان وەحــشەتە
بــێ تــەبیبی وەســلی دڵبــەر پەشمــە لوقمــانی حــەکیم
زوو عیلاجی دەردی خــوت کــە چــاری دڵ هــەر ســەفوەتە
زۆر گوتن قورئان بە کەلکە (عاصی) بەسیە بــێ شــعوور
رووله ڕێگای راست و حەق کــە تــا نــەمردووی فورســەتە

٢٠جمادالاول ١٣٩١ - ١٤ تەمووزی ١٩٧١

❊ ❊ ❊

(١٠)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

سـەبا هەسـتە بچۆگوڵـشەن بڵـێ عاشـق خرۆشـانە
بڵێ غونچە تەبەسـسوم کـا لـەوەی بولبـول کـە میوانـە
گوتی عاشق لەبۆ گوڵشەن بە نەشئەی وەسـڵەوە بـا بـێ
لە بن خەیمەی گوڵان یەکسەر لـەبی غونـچە بەخەندانـە
لـە لایـەك سـەروی رەعنایـە لەلایـەك لالـەوو نەسـرین
لەلایـەك بـەزم و غەوغایـە لەلایـەك مـوردو رەیحانـە
لەلایەك زەمزەمـەی سـاقی لەلایـەك شـۆری مەینۆشـان
لەلایەك دەنگی موتریب بـێ لـە مەدهۆشـانی مەیخانـە
لـە دەوری گوڵـشەنا دائـیم هجـوومی زولـف وئەگریجـە
حەسـاری بـاغی روی داوە دەلێـی ئینگلیـزو یۆنانـە
لە دامێنی گوڵـستانی کـە بـاغی سێوی سینەم دیـت
بەسـوخمەی ئـاڵی داپۆشـی گـوتی ئـەم گەنجـە پەنهانـە
کەسێ مەحرەم نەبێ بۆ عیشق ویـسالی نـابێ بـەم گەنجـە
ویـسالی ئـەو گوڵـستانە بـەزمگاهی شـەهیدانە

بە خاری گوڵ کەسێ جەرگی نەبێ لەت لەت لەوی مەنعە
لە زومرەی موفلیسان دوورە نەتیجەی شۆری مەستانە
کەچونکە رووحی پێ نادا بە پیاڵەی چاوی گوڵڕەنگان
تەماشای دەردی (عاصی ) کەن وەکوو بولبول پەرێشانە

* * *

## (١١)

**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**
**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**
(هەزەجی هەشتی تەواو)

فیــــدای باڵڵــای بڵنــــدت بم دەڵێـــی ســـەروی گوڵــــستانە
بــە ســـەرگەردی جــەماڵت بم دەڵێـــی خورشــیدی تابانـــە
ئیــشارەت کــە لــەبۆ کوشــتن بــە پەنــچەی شــێوە زیوینــت
بڵێ‌هـــات مەوســـیمی مــەرگت ســبەینێ جــەژنی قوربانــە
لەبورجی زولــەتی زولفــت کــە شــەوقی رووت تولــووعی کــرد
موئــــەززین بــــانگی عیــــشقی دا وەرن وا رۆژی دیوانـــە
قەزییـــەی مانیعولجەمعـــە لـــەڕووی تـــۆدا چـــە قـــەوماوە
قەمـــەر مەعلوومـــە وا دیـــارە لەناوەنـــد بـــورجی میزانـــە
نـــەخۆش و دەردەداری تـــۆم ، کـــەوا گــوڵ ســورمە ، رووم تێکــە
ببیـــــنم ســــێوی دوو کوڵمـــت نموونـــەی بـــاغی ریزوانـــە
بڵـــێن عاشـــق وەرە ســـەیری ئـــەوا هـــات ســـوخمە چـــیناوی
بــە دوگمــە قــوفلی دا ســینەی دەڵــێ ئــەم گەنجــە پەنهانــە
قەزییـــەی ئیتتیفـــاقی بـــوو تـــرازا بەنـــدی سەرســـینەی
گــوتی (عاصــی ) تەماشــاکە دەڵێــی بــەفری کــەلی خانــە

نەخۆش بووم بۆ شیفا پێم گوت کەرەم فەرمووکەبۆنی کەم
گوڵی ئەو جووتە سێوانەچزەی سەر خۆش و مەستانە
کە دەستم گەییە سەر سینەی بە غونچەی لێوی سەرمەست بووم
گوتم گەر دمکوژی فەرموو گوتی ئەم جارە ئیحسانە
گوتم خۆخاڵی سەرکوڵمت زیارەتگاهی عوششاقە
دڵی نەشکاندم و فەرمووی حەیاتبەخشی شەهیدانە
کە لێوم نایە سەر کوڵمی گوتی (عاصی ) بدە رووحت
وتم پێشکەش بە ئەبرۆت بێ دەڵێی شێری خوراسانە

* * *

## (١٢)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

لەدەنگی ئەلویداعی دڵ هەموو عالەم پەرێشانە
لەهەر لایێ تەماشاکەی سەدای ناڵین و گریانە
هەموو عالەم لە ناڵینە وەکوو ناڵینی یەعقووبی
دەڵێن وا یوسفی ئێمە ئیرادەی دەشتی کەنعانە
دەڵێی چاوم لە تاوی ئەو گەیشتە حاڵی(وابیضت)
بە تاوی ئاگری دووری هەموو هەر سینە بریانە
عەجەب ئەخلاق و لوتفی ئەو بە عالەمدا کە شامیل بوو
لە ژێر سایەی ئەوا گشت کەس شموولی لوتف و ئیحسانە
عەزیزی ئێمە بوو قوربان عەزیزێ بوو مەقامی تۆ
موبارەك بێ خوداحافیز ئەوەش هەر لوتفی ڕەحمانە
لە ئەوسافی ئەوا(عاصی) کە فیکری قاسیرە ئیمڕۆ
زبانی لەنگ و ڕاوەستا خەریکی دەردی هیجرانە

* * *

## (١٣)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

ڕوو گـــوڵی گـــەردن مینـــایی هـــات بـــە عیـــشوەو لارەوە
مــــــورغی دڵ کەوتۆتــــــە داوی وا بەناڵــــــەو زارەوە
چـــاو غـــەزالی لەنجـــە کـــۆتر قـــەد نـــەمامی عەرعـــەری
بـــەس بـــە عیـــشوە ڕابـــوورە بـــەو کـــەوای گوڵـــدارەوە
عالـــەمت خـــستۆتە زیللـــەت تـــۆ بەعیـــشقی چـــاوەکەت
مـــن کـــە مەســـتی چـــاوی تـــۆ بم چـــم بەســـەر خومـــارەوە
پەرچـــەمت هاتۆتـــە سەرســـەفحەی جـــەماڵت چـــین بـــە چـــین
گەوهـــەری گـــەنجی جـــەماڵت وا بەدەســـت ڕەشمـــارەوە
کـــافری موتلـــەق ببینـــێ کەعبەتـــەینی ڕوومـــەتت
بـــۆ تـــەواف ئیحـــرام دەبەســـتێ چـــی بەســـەر زوننـــارەوە
مـــوعجیزەی ڕووی تـــۆ ببینـــێ دینـــی مووســـا تەرکـــەکا
دێتـــە ســـەر دینـــت یـــەهوودی چـــی بەســـەر ئینکـــارەوە
موددەتێکـــە دەرســـی عیـــشقت ئیـــستیفادەی لـــێ دەکـــەم
ئێـــستەکەش فـــەننی ویـــساڵت هـــات بەچـــەند ئەســـرارەوە

ئـــەو قەزییـــەی وا لـــە رووتـــا زەحمەتـــە حـــەللی بکـــەن
فـــەهمی ئـــەفلاتوونی تێکـــدا وا بەچـــەند تۆمـــارەوە
حیکمـــەتی لوقمـــان چـــە فایـــدە تـــیری موژگانـــت ببـــێ
ســـەد حـــەکیمی حـــازیق ئیمـــڕۆ و، بـــەپای ئـــازارەوە
مورغی فەهمی چەند موسەننیف کەوتـە داوی عیـشقی تـۆ
دەنگـــی نالـــەی جـــەرگ و دڵیـــان دێ بەدەســـت شمقـــاڕەوە
هەرکەســـێ عیـــشقی نـــەبێتن ئـــەهلی دڵ واوا دەڵـــێن
پێـــی مـــەڵێن ئینـــسانە بـــەڵکوو نەقـــشە بـــەو دیـــوارەوە
(عاصی ) ڕووح تەسلیم نەکەی تۆ عیشقبازی چۆن دەکـەی
گـــەر هـــەوا خـــواهی ویـــسالی چـــت بـــە ســـەر گـــوڵزارەوە

❊ ❊ ❊

(١٤)

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
(هەزەجی هەشتی تەواو)

ئـەوا دەوریـان لـەدڵ داوە غـەم وحەسـرەت لـە هەرلایـە
میسالی من لەگـەڵ دڵبـەر وەکـوو مـەجنوون و لەیلایـە
پەرێـشان و پرێـشانن دڵ و جـەرگم بـە غـەمزەی ئـەو
تەماشای چاوی مەسـتی کـەن شـەرابی مـەرگی تێدایـە
جەمال وگەنجی حوسنی ئەو لە دڵ یاسـاغە سـەیری کـەن
چلۆن رەشمـاری دوو زوڵفـی لـە گـەردنی زیـوی ئالایـە[1]
بەرەو مەغریب کە وەستابووم لە ناکاو رۆژ لەوێ دەرکەوت
کە تێفکریم گوڵی من بوو بەرەو مەشـریق کـە وەسـتایە
کە چاوم کەوت بە دووچاوی غەریقی بەحری حـیرەت بـووم
ئیلاهـی ئـەم پـەری زادە چـلۆنی بێنمـە سـەر رایـە
سوپای ئەگریجەوو زوڵفـی وەکـوو چـین و فـەرەنگ هـاتن
دڵیـان بـردم بـە یەخـسری کـە نوختـەی خـاڵی دانایـە
فیدای بالاوو لەنجەت بێ دڵ ورووحـم ، گـوتی (عـاصـی )
بکە رووحت بە پێشکەشمان ئەگـەر وەسـلت لـە دڵدایـە .

❊ ❊ ❊

---

(١) (گەردنی) دەبێ زۆر بە سووکی بخوێنرێتەوە بۆ ئەوەی کێشەکە دروست دەربچێ.

(١٥)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی مەشتی ئەخرەبی)
(مەکفووفی مەحزووف)

مەحموودی جەمالت کە ئەدا لافی ئەمارەت
چەند جوانە لەوێ خاڵی ئەیازت بە وەزارەت
مژگانی بەجارێ کە دەکەن هێرشیی تیر
دەیبەن بە حەزینی دڵەکەم وا بە ئەسارەت
ئەو پەرچەمە رەیحانە کە پەرژینە لە گوڵشەن
مومکین نییە بۆ بولبولی دڵ بێتە نەزارەت
زوڵفی وەکو زنجیرە لە پێی عاشقی بێچار
گەردەن کەچە بۆ شیری بڕۆت دڵ بە حەقارەت
وەرە ئەی دڵبەری رەعنا مەکە قەتڵم بە بڕۆت[١]
دڵ بێ بە فیدای پەنجەوو ئەو لێوی جغارەت
(عاصی) نییە هۆشی چییە شایستەیی مەدحت
خۆت حاکمی تەحسینی لە سەر تەختی سەدارەت

* * *

١ ئەم لەتە کێشەکەی جیایە. کێشەکەی.

## (١٦)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان**
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

هاتمە دەرگەت دڵبەری من[١] چونکە تۆی مەحموودی ڕاست
کعبەی لوطفی ایازت قیبلەی مقصودی ماست
من لە ترسی تیری دوژمن هاتمە قاپی غیرەتت[٢]
دشمن خونخوار دلرا نفس چون نمرود ماست
زوعفی کردم جەوری زاڵم غەم دڵی داگرتووم
غرق از موج ندامت فکر بس[٣] نابود ماست
شاهی خووبان سەد دەخاڵەت وام لە گێژاوی گوناه[٤]
ایکە عفوت[٥] التفاتی از دری معبود ماست
عالەمێ بێزارە قوربان وا لەدەست گریانی من
نالە درسینە چو ایسد[٦] ابر نیسان دود ماست

---

١ لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە : ( پادشاها )
٢ لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (من لەخۆفی تیری دوژمن هاتمە دەرگانەی ئەتۆ)
٣ لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: ( رذالت ،قامت )
٤ لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: ( لەناو دەریایی بی غەم )
٥ لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (لطفت )
٦ لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (باشد )

مــــن لــــەتاوی دەردی دووری دائیمـــــا هەرناڵەمــــە
زخـــم از شمـــشیر هجـــرت دم بـــدم [1] موجـــود ماســـت
گـــەر دەپرســـی دەفعـــەیێکی حـــاڵی (عـاصـــی ) ناتـــەوان
مفتخـــر بـــر چـــرخ گـــردون بخـــت بـــس مـــسعود ماســـت

❊ ❊ ❊

[1] لەدەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە : (هر زمان )

## (١٧)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

سەد ناوی خودا بێ لە دو ئەبرۆیی هیلالت
نەققاشی ئەزەل جەدوەلی کێشا لە جەمالت
پەروانەیی رووی تۆیە دڵم تۆ بکە بڕوا
رووحی کەدەکا پێشکەشی شەمعی خەت و خاڵت
حاشا نییە یەك ئەووەل و سانی کە ئەتۆ بی
مەعلوومە لە نەوعی بەشەرا نەبووە میسالت
حوکمی نییە هیچ کەس لەسەر ئیقلیمی دڵی من
غەیری ... ئەتۆ چونکە ئەتۆش حوسنە جەلالت [1]
باوەڕ بکە پەروا نییە (عاصی ) لە فیراقت
دائیم کە دەسووتێ لە دلا شەمعی خەیاڵت

* * *

[1] ئەم لەتە بڕگەیەکی کورتی لە دوای ووشەی (غەیری) کەمە .

## (١٨)

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
(هەزەجی هەشتی تەواو)

کــه مــن خێـرم نـەبوو قوربـان لـه ئاموشـۆیی دیوانـت
خـودا حـافیز ئـەوا رۆیـم لـه بـۆ زینـدانی هیجرانـت
ئەگەر چە من لە لام خۆش بوو بە دڵ ئەمما ئـەتۆ قوربـان
لەلات عار بوو منی بێکەس کە جارجـار ببمـه میوانـت
ئەگەر یادی منت کرد تـۆ مـەڵێ زۆر بـێ وەفـا دەرچـوو
وەفـــادارم وەفـــادارم قەســـەم بـــەو مـــاهی تابانـــت
خەتای تۆ قەت نەبوو جانا رەقیبی سەگ سیفەت وای کرد
وەکوو بولبول کەمەحرووم بم لە غونچەی لێوی خەنـدانت
نەخۆشـێکم گـەلێ بێهـۆش خـەریکی فیکـری دەرمـانم
کە مەئیوس بووم لە غەم خواری وتەداوی لوتفی لوقمانت
لە دەستی بەختی سەرگەشتە ئەوا وێڵ بـووم بـه دونیـادا
بە دڵ توخدا دوعـا فـەرموو لـه بـۆ بەنـدەی پەرێـشانت
نەتیجەی قەت نەبوو بۆ من ئەوەندەی داری سـەبرم چـاند
مـەئالی بوومـه مـەنفووری هـەموو ئـەتباع وخوێـشانت
غـــەریب و بێکـــەس و عـــاجز برینـــدار و دڵ ئـــاوارە
گەڵێ شـوکرم ئـەمن جانـا موهـاجیر بـووم لـه دەربانـت
بەتەن هەرچەندە لێت دوورە بە دڵ هەر حـازرە (عاصـی)
لە هـەرجێ دابنیـشم مـن مـنم مـەدح و سـەنا خوانـت

❊ ❊ ❊

## (١٩)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

دڵـت بـردم بـە یـەکجاری بـە نەشـئەی خـەتتی ڕەنگینـت
مەتاعی عەقڵ و هۆشت بـرد بـە غونـچەی لێـوی شـیرینت
دڵـت خـستوومە نـاو چـاهی زەنەخـدان وئەسـیرت کـرد
پەرێـشانە بـە زنجـیری دو گیـسووی زوڵفـی چـین چـینت
زیارەتگـاهی عوشـشاقە هەمیـشە وەك حەجـەر خاڵـت
فیـدایی کەعبـەیی ڕووت بم ئـەوا هاتوومـە سـەردینت
لـە هیجرانـت ئـەوا مـردم کـەوا پەشمینـە رووم تـێ کـە
تەماشـای گوڵـشەنی ڕووت کـەم ببیـنم کـوڵمی لـەعلینت
لـە هـەرلایێ ئـەوا هـاتوون سـەفی عاشـق لـە بـۆ دیـتن
منیش هـاتووم ئیشارەت کـە بـە کوشـتن چاوی شـاهینت
فتـوای کوشـتن بـدە قوربـان بلـێ جـەللادی چـاوت بـێ
بکـا بـا تیرەبـارانم بـە دوو ئـەبرۆیی قەوسـینت
مەسـیحادەم لـە پـاش مـردن وەرە سـەرقەبرەکەم جـارێ
منـیش سـەجدەکونان هەسـتم بـە یـادی عیـشقی دێرینـت
بلـێ وا هاتـە پابووسـم شـەهیدی تیغـی عیـشقی مـن
بفـەرموو بـا خـەڵاتی کـەن لـە گـەنجی سـینەیی صـینت
لە مەحشەر گەر بڵێن (عاصی ) نیشانت کوا شـەهیدی تـۆ
لە هەرجێ را ئـەبوێرم مـن بـە شـاهید پەنجـەیی خوینـت

❊ ❊ ❊

(٢٠)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

ئـەوا فـەرهادی مـەیلی دڵ بـە یـادی زەوقـی گوڵـچینت
لە بێستوون کەندنی هیجـرە بـە هیـوای وەسـلی شـیرینت
لـە ئیقلیمـی دڵـم قوربـان بـە دایـم خوسـرەوی لوتفـت
سوپای خستۆتە دوای حەسرەت لە موڵکی شەوقی ماچینت
بـە شـەوقی شـەمعی رووی تۆیـە دڵـم پەروانـەیی زارە
سەروسـینەم بـە جۆشـە مـن بـە تـاوی عیـشقی نارینـت
هـەوام کەوتۆتـە لاف لێـدان لەگـەڵ ئاسمـانی هەفتەمـدا
کە نووسیبووت سەلامی مـن بـە پەنجـەی شـێوە زیوینـت
تەمەننام وایـە ئـەی جانـا کـە تـەیری مەقـسەدت دائـیم
ببێتـە سـەیدی ئومێـدت بـە قـووەی دەسـتی شـاهینت
خودا قەت ئاموشۆت نەبڕێ لە جادەی عیـززەت و تـەوفیق
بـە دائـیم هـەر درەخـشان بـێ سـتارەی بـەخت و ئایینـت
منم (عاصی ) لە خـوام مەتلووبـەو و داوایـە ئـەی جانـا
لـە مـەودای شـیری بـەدگۆیان عەدالـەت ببتـە پـەرژینت

* * *

## (٢١)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

لەجەوزا و سونبولە و میزان لە بورجی جەدْی و دەلْـوو وحـووت
قەمـەر دەرکەوت لەگەڵ عەقرەب لە ناو میحرابی دوو ئـەبرووت
لــە رۆژی نــووری روخــسارت قەمــەر بــووە موقتەبــەس جانــا
کــە لێــوت زوهرەیــە قوربــان منــیش خۆمــشتەریم بــۆ رووت
عەتاریــد خــاڵی ســەرلێوت کــە مەرڕێخــە زەنەخــدانت
لە عیشقی چاوەکەی مەســتت زوحـەل وا هاتــە ژێـر ئـەبرووت
ســەفی عاشــق ئـەوا هــاتوون دەســوورێن وەك بەناتوننــەعش
بە سینەی ریش و ئاهی سـەرد لـە دەورەی قـوتبی خـاڵی رووت
منــیش هــاتووم لــە بــۆ کوشــتن بفــەرموو بمکەنــە قوربــان
لە دوای مەرگیش سەری (عاصی) فیدایی دەست و هەم بازووت

* * *

## (٢٢)

**مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن**
**مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن**
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

دووبــــارە ئــــەوا دەردی غــــەمم بۆتــــە جــــەفادەر
ئاوێنــــە لەگــــەڵ روویــــی ئــــەتۆ هاتــــە بەرابــــەر
هەرچــــەندە لــــەرووی نیــــشتووە وا گــــەردی خەجالــــەت
پێــــی خۆشــــە لەبــــەر خەجلــــەتی خــــۆی بــــشکێ سەراســــەر
عــــاجز مەبــــە ســــەروو کــــە لــــە باڵاتــــە بڵندتــــەر
مەعلوومــــە کــــە بــــێ عەقلــــە کــــەوا بۆتــــە هەواگــــەر
گــــەربێت و لەگــــەڵ لێــــوی ئــــەتو غونــــچە بپــــشکوێ
مەمنوونــــە بەئــــەو لوتفــــە ئەگــــەر ببنــــە بــــرادەر
عاشــــق بــــووە بــــۆ روویــــی ئــــەتو گــــوڵ وەکــــو بولبــــول
مەنعی مەکــــە (عاصــــی )کــــە دەروون بــــوو بــــە ســــەماوەر

* * *

## (٢٣)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

سەرووبالاّ لێو عەقیق دندان سەدەف [١]
من لە بۆ مژگانی تیرت وا دڵم کردە هەدەف
باوەسییەت بێ بەتیرت گەرئەمن چوومە فەنا
دەچمە ناو زومرەی شەهیدان با نەخۆن بۆ من ئەسەف
چوونە ژێرخاکی فەناوە زۆر بە ناڵەی عیشقەوە
موفتەخیر بوون بەو برینە عاشقانی (ماسەلەف )
توخودائەی سەروی دڵبەر بامنیش مەحرووم نەبم
تا لە مەیدانی حەشردا من لە گەڵ وان ببمە سەف
دڵ فیدات بێ شاهی خووبان بمکوژە خوێنم نییە
با نەڵێن بێ هوودە ڕۆیی عومری( عاصی ) بوو تەلەف

❊ ❊ ❊

[١] لەتی یەکەم لە باتی چوار (تفعیلە ) ، سێ تەفعیلەیە . (فاعلاتن ) ێکی کەمە .

## (٢٤)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

وەكوو بولبول لەگەڵ گوڵدا بەبێ خاری جەفاناكەم
لەگەڵ دڵبەر چ دڵداری بە بێ شەرت و وەفا ناكەم
كەدڵبەر دوێنێ وای فەرموو سبەینێ جەژنی قوربانە
چلۆن بەو موژدەیە جانا ئەمن سەیرو سەفا ناكەم
گوڵم ئیمڕۆكە وەعدی دا گوتی وەك خار وەرە بەڕێم
بەهای ئەو لوتفە ئەو كردی بەغەیر ئەز رووح ئەدا ناكەم
بە فەتوای پیری مەیخانە خەریكی مەزهەبی عیشقم
وەكوو زاهید لە رووی عالەم ریاكاری و حەیا ناكەم
بە تیری عیشقە من جەرگم فوارەی خوێنی لێ دەڕژێ
برینی قڵمژەی دڵبەر بە سەد لوقمان دەواناكەم
خوتەن بۆ قیمەتی چاوت حەقیقەت فیكری نادانە
ئەمن سەودایی یەك لەنجەت بە ماچین و خەتا ناكەم
ئەوا رووحم لە مەیدانە ئەگەر وەسلت ببێ ئەسلی
بزانە عاشقە ( عاصی ) كە سەودای بێ بەها ناكەم

❊ ❊ ❊

(٢٥)

مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

هێنامییە ئەم دەرگەیە ئیمرۆکە نەسیبم
هەرچەندە کە بێ سەبرو دڵ ئارام و شەکیبم
سارێژو قەپاتی بکەی ئەی خوسرەوی شیرین
بۆ دەردی دڵی خەستە کەوا بوویە تەبیبم
دڵ ڕیش و جگەرپارە وو مەفتون و زەبوونم
ئاوارەوو سەر ئاسیمە بێ عیشق و غەریبم
تێ بەربووە ئاگر بەتەواوی لە دەروونم
بەدناوی کە کردم لە جیهان جەوری ڕەقیبم
بێ عیلم و شەرەف کەوتمە زیندانی جەهالەت
وەك ساحیری بەدبەختە ڕەقیب داویە فریبم
هاتوومەتە ئەم دەرگە بە عینوانی دەخالەت
هەرجێگەمە ئەم قاپییە تا ڕۆژی حەسیبم
(عاصی) بە هیوای فیکری نەجاتە لە جەنابت
تۆش وا مەکە لەو لوتفە کە بێ بەهرە بەری بم

* * *

## (٢٦)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

ئەگەر ئاوێنە تەشبیە کەم بە روویی تۆ ئەمن رووت بم
هیلاکی دەردی دووریت و کوژاوی تیغی ئەبرووت بم
بە غەیری تۆ بە دڵداریٚ بدەم گەر دڵ ، وەفادارا
بە دوو زوڵفی تەنافینت لەگەڵ سێدارەدا جووت بم
بە بیٚ دوو چاوی مەستی تۆ ئەگەر مەست بم بە بادەو مەی
بەناکامی لەوەسلی تۆ هیلاکی چاوی جادووت بم
لە دڵ ناڕویٚ ئەنیسی من ئەگەر بیێت و لە فیکرت کەم
حەڵاڵ بیٚ بمکوژە خوێنم فیدایی دەست و بازووت بم
لە دووری تۆ ئەگەر شادبم لە شادی دوورو بێبەش بم
بە حوکمی قودرەتی باری کە مەنفی هیندو بێرووت بم
ئەگەر بیدەم بە جەننەت من غولامیی کۆیی تو جانا
لە مایەی وەسڵی تۆجانا بە دائم رووت و نابووت بم
بەرابەرکەم لە گەڵ لێوت ئەگەر لە علی بەدەخشانی
منی (عاصی ) لە هیجرانت بە قوربان رووت و نابووت بم

❊ ❊ ❊

## (٢٧)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

وەرە ئەی شۆخی پەرچەم ئاڵ غەزالی چاو بە خومارم
بە لەنجەت ئاهویی چینی ئەتۆ ئەی سەروی گوڵزارم
هەزارانی وەکوو مەجنون لە سەودای عیشقی تۆ شێتن
بە ئۆمێدی وەفای لەیلا منیش لەو حاڵە بەشدارم
بە پەنجەی ئاڵی خوێناویت ئە تۆی عاشق کوژ و دڵبەر
منیش هاتووم لە بۆ کوشتن گەلێ لەو عومرە بێزارم
ئەلا ئەی مورغی خوشخوانی گوڵستانی وەفا فەرموو
بە هەر نەوعێ دەکەی قەتلم نەبێ باکت بە ئازارم
بە ئومێد دانەیی خاڵت ئەسیری داوی زوڵفت بووم
بە پەیمانی موژەت بۆیە بڕاوە جەرگی خونخوارم
دوای مردن دەڵێم مەمشۆن لە کفنیش لێم گەڕێن یاران
شەهیدی تیغی دوو ئەبرۆی غەزالی چاو بە خومارم
لە ژێر شمشێری ئەبرۆتا کەچە خۆ گەردەنی ( عاصی )
بلێ جەللادی چاوت بێ بکا قەتلی دڵی زارم

* * *

## (٢٨)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەولو)

قەمەر هاتۆتە سەر ئیکلیل بە ئومێد فیکر و تەدبیرم
لە عیلمی جەفرو هەم حەرفا خەریکی بەست و تەکسیرم
لە رەمل و زیج و زایرجە لە قەبزی خارج و داخل
لە بەیتی نەسرەتی داخل ( نقی الخلد ) ە زنجیرم
لە ئەفلاکی عیشقبازی دڵم بۆتە زوحەل سەیری
منیش وەك مشتەری جارێ لە دەوری زوهرە تەئخیرم
قەمەر یارە لە رەغمی من دەچێتە مەنزلی بەلدەت
لە سەر (سعدالسعود) م دی نیشانەی بەخت و تەئسیرم
چ جێگەی لۆمەیە یاران کە ئەو قوتبە دڵم جەدیە
نیشانەی قیبلە ناسینمە مەکەن ئینکارو تەکفیرم
بە دائیم بۆ ویسالی ئەو خەریکی رابیتەی ویفقم
لە حەولی مەعریفەی سرڕام لە سەر کوبرا وو تەسغیرم
موتالای فەننی جەفرم کرد لە بەست وکەسر وئیزماری
نەتیجەی وەسڵی پێدام و مەگەرما هیممەتی پیرم

که جەمعی کەعبی حەرفم کرد لە بۆ تەئسیری ئەو رەمـزە
کە تـێ فکـریم بـووە ئەسـسی جـەنابی پـیری دەسـتگیرم
گوتم بەسیە ئـیتر (عاصـی ) چـییە ئـەم لاف و دەعوایـە
کە تۆ جەهلی مورەککەب بی مەڵێ مونـشییی ئیکـسیرم

* * *

## (٢٩)

مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

مـــەحمووده خـــەتی حوســـنی جـــەمالت بـــە قیاســـم
بـــۆ دوررِی مـــەعانی وەکـــو غـــەوواس و هەیاســـم
هاتۆتـــە تەبەســـسوم بـــە ســـەبا غونـــچەیی فیکـــرم
ســـەرتا بـــە قـــەدەم فەرشـــی غـــەزەل بۆتـــە لیباســـم
کەوتوومەتـــــە ژێربـــــاری غـــــەم و دەردی فیراقـــــت
بـــاوەرِ مەکـــە لـــەو دەردە چ دەرچـــوون وخەلاســـم
بـــاکم نییـــە عالـــەم هـــەمو بـــەدگۆ وو عەدوومـــە
ســـەرحەڵقەیی ئـــەم عیـــشقە بـــەدڵ واکەدەناســـم
ئـــەی شـــاهی جیهـــان دڵبـــەری رەعنـــایی زەمانـــە
موحتـــاجی بـــە دەرمـــانی وەســـڵ جـــەرگی پەلاســـم
بـــێ نەقـــدی ویـــسالت لـــە جیهـــان نیمـــە رەواجـــێ
بـــێ زەوق و ســـەفا بـــێ دڵ و هـــەم عـــەقڵ و حەواســـم
(عاصـــی ) م وکەمـــەر بەســـتەوو کـــەمتر لـــە غولامـــت
جێـــی فـــەخرە کەلـــەمَ دەرگەیـــە زەببـــال وکەناســـم

❊ ❊ ❊

(٣٠)

**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**
**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**
**(هەزەجی هەشتی تەولو)**

زەمانێکــە ئەســیرت کــرد بــە خــاڵی رووت دڵ و دیــنم
فیــدای گــوڵزاری حوســنت بم خــەریکی زوڵفــی چــین چــینم
نیقــابی پەرچــەمت لادە لــە ســەربەدری جــەمالی خــۆت
زیارەتگــاهی عوشــشاقە کــە رووتــە کەعبــەیی دیــنم
وەرە دڵبــەر بکــە رەحمــێ لــە رێ خــوا دەفعــەیێ قوربــان
بــە شــەوقی شــوعلەیی کوڵمــت بــدە ئــارام و تەســکینم
دڵــم تــەیرێکی زیــرەك بــوو بــە داوی زوڵفەکــەت گرتــت
بــە دانــەی خــاڵی بەرچــاوت کەکێــشات رووحــی شــیرینم
سروور و شادمان بــوو چــوو بــە نەشــئەی پەرچــەمی ئاڵــت
بــەیادی وەســڵی دێرینــت خــەریکی شــیوەن و شــینم
مــەڵێن چــاهی زەنەخــدانت شــیفا بەخــشی دڵــی ریــشە
خوسوســەن مــن زەدەی خــۆتم بــەدائیم دیــدە پــڕ خــوینم
کــڵاولاری کــەوا پــەشمین لەســەر چــی عــاجزی لێمــان
لــەرێ خــوا مەرحەمــەت فــەرموو بــە لەنجــە بێــرە باڵــینم

له وەختی نەزعی ڕووح جانا وەرە بەینێ تەماشات کەم
ببینم خاڵ و ئەگریجەت لە باتی دەنگی یاسینم
وەسییەت بێ ئەگەر مردم لە کەعبەی رووت بکەن رووی من
بەرەسمی عاشقانی خۆت بفەرموو وەعزو تەلقینم
نەکیر گەر هات و لێی پرسیم گوتی عاشق چییە دینت
دەڵێم مەعشووقە دەیزانێ لەگەڵ ئەودا کە هاودینم
بەپەیکانی موژەت جانا ئەگەر (عاصی ) بە کوشتن چوو
لە مەحشەر شاهیدە یەکسەر لیباس و زامی پڕخوینم

* * *

## (۳۱)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

جێژنی قوربان هات و قوربان مـن خـەریکم غـەم دەخـۆم
دەسـت دەبـەم بـۆ سـەر تـەعام و وادەزانم سـەم دەخـۆم
ئێـشی دەردی دڵمـە جانـا وا منـی خـستە فغـان
خـوێنی جـەرگی خۆمـە دائـیم مـن بـە زارو دەم دەخـۆم
ئەلبیـسەی جێـژنم ببینـە حەسـرەت و ناڵاندنـە
( راحـة الحلقـوم ) بخـۆم و عـەینی هەرشـەڵغەم دەخـۆم
زەوقـی تێکـداوم بـە جـارێ لـەززەت وخۆشـیم نـەما
قووتی رووحم بۆتە میحنەت قووتی دڵ کـەم کـەم دەخـۆم
بۆیـە نـابووت و زەبـوونم رەنـگ و رووم وا زەرد بـووە
بولبول ئاسا غەم لـە وەسڵی غونـچەیی نـەو دەم دەخـۆم
دەردی مـن پەنهانـە قوربـان چـاکە ئـەمجا پێـت بڵـێم
زەهـری جـەوری دوژمنانـە مـن لـە بـاتی جـەم دەخـۆم
تۆی تـەبیبی دەردی (عاصـی ) سـەد دەخالـەت چـارەیێ
ژیانی مـن کـەڵکی نـەماوە میحنـەتی مەرهـەم دەخـۆم

* * *

## (٣٢)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەل هەشتی مەقسوور)

بۆ ئومێدی زیندەگانی قووتی غەم جەم جەم دەخۆم
کەوتمە داوی پەرچەم و هەم زولفی پڕ خەم خەم دەخۆم
سەد کە دایم من خەریکی عەیش ونۆش و عوشرەتم
بۆیە بێ تەئسیرە جانا میحنەتیش دەم دەم دەخۆم
جێژنی قوربانە سبەینێ وەختی وەسلە بۆ تەواف
شەربەتی دیداری یارو چاوەیی زەم زەم دەخۆم
مەیلی وەسل و دەردی دووری کردییە ( ضیق النفس )
چیم لە ژیانە بۆ نەجاتی دەست هەناسەم سەم دەخۆم
یار ئەگەر چە جار بە جاریش خۆی نیشانی من ئەدا
بۆنی گولزاری کەناکەم بەو دەماغەم غەم دەخۆم
قسمەتی رۆژی ئەزەل بوو(عاصی )غەمناکی ئەتۆ
ئەزیەت و جەورو جەفا وو میحنەت و هەم هەم دەخۆم

❊ ❊ ❊

## (٣٣)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلان
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

لــه ئامووشــۆیی خزمــەت تــۆ تکــا ئــاوی حــەیا قوربــان
وەکـــوو دێوانـــە وا ڕۆیـــم منـــی سەرگەشـــتە ســـەرگەردان
نەســـیبی مـــن ئـــەزەل وابـــوو کـــە هـــەر دێوانـــە بم دائـــیم
وەکوو مەجنوونی خێڵی حەی خەریك بم مـن لـه سـەر هـەردان
مەفەرموو بـێ وەفـا دەرچـوو لـه سـەر عەهـدی قـەدیم مـاوم
لـــه بـــەربێ لوتـــف و مـــەیلی تـــۆ گرفتـــارم بەچـــەند دەردان
لـــه ئـــەو ڕۆژە وەکـــوو گـــرتم بەدەســـت و دەم کـــە دامانـــت
له عەرسەی قیامەتیش قوربان نییه قەت فیکری دەست بەردان
لـه بـەینی تـۆوو مـن یـارەب ڕەقیـب هـەرکوێرو ڕوورەش بـێ
پەراگەنـدەی ولاتـی کـرد منـی مـوخلیس وەکـوو جـەردان
ئەوائـەی گـوڵ ئـەمن ڕۆیـم خـودا حـافیز لـه خزمـەت تـۆ
ئەتۆش جارجار دوعـا فـەرموو لـەبۆ بولبـول وەکـوو مـەردان
خـەیاڵی وەسـڵی بـاڵای تـۆ بـەتاڵ نـابێ لـه لای (عاصـی)
هـــەتا ئـــەو ڕۆژە دەینێنـــە کـــەلێنی قـــەبرو دووبـــەردان

❊ ❊ ❊

## (٣٤)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

وەجهـــی چـــییە وەك ســـینەمە بریانـــە دڵـــی مـــن
مـائیـــل بەغـــەم و شـــیوەن و گریانـــە دڵـــی مـــن
لـــەم دەشـــتە کـــە ســـەحرایی فیراقـــە بـــەدەوامی
دائـــیم لـــە غـــەما زارو پەرێـــشانە دڵـــی مـــن
وەحـــشەتکەشی کێوانـــە لـــە بـــەر میحنـــەتی دووری
وەك مـــامزی تـــەنها کـــە لـــە هەردانـــە دڵـــی مـــن
واحـــوجرەیی سینەم هـــەمو پـــڕ فەرشـــە لـــە حەســـرەت
ســـەیری بکـــە ئـــەی غـــەم خـــەمی میوانـــە دڵـــی مـــن
بـــێ هوودەیـــە دەرمـــانی تـــەبیب دیققـــەتی دختـــۆر
کـــوژراوی مـــوژەی تـــیری جەوانانـــە دڵـــی مـــن
ئـــالوودەیی خوێنینـــە لـــە بـــەر خـــوێنی سرشـــکم
لـــەم مەوجـــە کـــە دەریایـــە چـــە نادانـــە دڵـــی مـــن
لـــەو حیکمەتـــە وازبێنـــە کـــەنازانی لـــە دەردم
فـــەوتانی بـــە دەرمـــانی تەبیبانـــە دڵـــی مـــن

کەوتۆتـــــە شـــــلێوە لەهـــــەوا ســــۆزی هەناســــەم
خۆفەســـــڵی بـــەهاری هــــەمو زســــتانە دڵـــی مـــن
(عاصـــی ) چـــییە واتیـــژە سرشـــکت وەکـــو رێـــشین
نــــاڵینی دەڵێـــــی زەلـــــە کەناڵانــــە دڵـــی مـــن

* * *

(٣٥)

مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفوولی مەحزووف)

بـــەم دەردە کـــە عیـــشقە چـــییە حەیرانـــە دڵـــی مـــن
هـــاوارە تـــەبیب بـــێ تـــو بـــە دەرمـــانی ســـەری مـــن
گـــەر هـــات و لـــە حەققولقـــەدەما رووحـــی بـــوێتن
پـــێم خۆشـــە ئەگـــەر بیخەنـــە دامـــانی ســـەری مـــن
جـــانم ســـوپەری تـــۆبی لـــە بـــەر تـــیری بـــەڵاتا
گـــەردەن کەچـــە گـــەر دەیکەیـــە قوربـــانی ســـەری مـــن
حاجـــەت نییـــە ئـــەم دەردە کـــە هیجرانـــە بـــەدەووا
یـــەك لـــەحزە ویـــسالی بەســـە لوقمـــانی ســـەری مـــن
(عاصـــی ) کـــە زەدەی تـــیری فیراقـــە لـــە ویـــسالا
بێـــزارە دەڵـــێ بـــۆ نییـــە فـــەرمانی ســـەری مـــن

❊ ❊ ❊

## (٣٦)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

دائـــیم بـــە جـــەفا شـــێوەیی گریانـــە دڵـــی مـــن
ســـووتاوی گـــڕەی ئـــاگری هیجرانـــە دڵـــی مـــن
وەك تـــەیری ستـەمدیدە لـــە دەســت میحنـــەتی هیجـران
حەپـــسی قەفەســـی ســـینەیی بریانـــە دڵـــی مـــن
بـــۆ تـــیری غـــەمی فرقـــەتی تـــۆ بۆتـــە نیـــشانە
دائـــیم بەتـــەمای هـــاتنی دەرمانـــە دڵـــی مـــن
وا غەرقـــە لـــەناو بـــەحری غـــەم و گێـــژی قەســـاوەت
جێـــی مەرحەمـــەت و هیممـــەتی پیرانـــە دڵـــی مـــن
مـــەیلی لـــە قـــەدەم بۆســـییە هـــەم خـــاکی دەری تـــۆ
بـــۆ وەســـڵی تـــو غـــەمخوارو پەرێـــشانە دڵـــی مـــن
مـــەفهوومی عـــەریزەم هـــەمو بـــۆ ڕەســـمی دەخالـــەت
ئومێـــدی بەســـەر حەلقـــەیی پیرانـــە دڵـــی مـــن
وەختـــی کـــەرەم و ڕەحمـــەت و ئازادییـــە قوربـــان
گەرمـــەیل ئەکـــەی لایـــەقی قوربانـــە دڵـــی مـــن

سەرگەشـــــتەووبێ بەهرەووهـــــەم پـــیرو پەرێـــشان
رەنـــگ زەردە لـــە ژێـــر پـــەردەیی عیـــسیانە دڵـــی مـــن
(عاصـــــی ) م وجەفادیـــــدەوو بـــــەدناوو غـــــەریبم
قابیـــل بـــە ســـەفاو رەحمـــەت و ئیحـــسانە دڵـــی مـــن

* * *

## (٣٧)

کێشی بڕگەیی ( ١٤ = ٧/٧ )

ئـەی یـاری سـەروو قامـەت گـەردن شووشـەی بلـوورین
ئەبرۆکـــەمانی چـــاوڕەش ئـــەی رووگـــوڵ ونـــازەنین
دەم غونـچەیی پەرچـەم ئـاڵ ئـەی شـۆخی نـەو رەسـیدە
چـــاو بـــادەیی مەیخانـــە ســـوخمە زەردی گوڵگـــوڵێن
روومـــەت سـێوی زوڵـف رەش دڵ بـێ فیـدایی لەنجـەت
کـراس کـەتانی ڕۆمـــی موبـــارەك بـــێ مـــەکر چـــین
زوڵفـــت لەگـــەڵ ئەگریجـــەت وەك عەســـکەری فـــەرەنگی
لەگـــەڵ خـــاڵی حەبەشـــتا هاتوونـــە ســـەر فەلەســـتین
ســـینە بـــاغی مـــەراغی بۆچـــی لـــە مـــن بـــەداغی
بـــەو قامـــەتی بەیـــداغی غارەتگـــەری عـــەقڵ ودیـــن
لێـــو ئـــاڵی چـــاو خومـــاری فـــەرموو ددان مـــرواری
ئـەی ئـاهوویی تاتـاری هەسـتە لـە پـێ کـە لاپـچین
وادەچـــمە ژووری مزگـــەوت دەکـــەم دوعـــایی وەســـڵت
لەگـــەڵ ســـۆزی هەناســـەم ئـــەتۆش بفـــەرموو ئـــامین
بـــۆ وەســـڵی دڵبـــەری خـــۆی (عـاصـــی ) ئـــەوا دەگریـــا
بیکـەی بـە قـسمەتی ئـەو یـارەب غەزالـەی ماچـین

## (٣٨)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

غەزالەی چین ئەوا هاتووە بە زولْف و پەرچەمی چین چین
لە دڵ دەعوا دەکا بڕوا لە دەورەی گوڵشەنی ماچین
بەتالانیان ئەوا بردووە حەواس و عەقڵ و هۆشی من
فیرارم کرد لەگەڵ دڵما لە دەست عیشوەی ئەگەر دەرچین
دەروونم پڕ لە گریانە هەناسەم ساردە ئەی یاران
لە دیدەم سەیری چۆن دەڕژێ سەراپا ئەشکی رەنگ خوونین
وەرن ئەی قەوم و خوێشانم ئەوا هات مەوسیمی مەرگم
وەسییەت بێ مەبن غافڵ لەدەنگی شیوەن و یاسین .
ئەگەر حەزکەن عیلاجی من لە ئەو دەردە گەلی یاران
دەکەم وامن دوعای وەسڵم بە عام ئێوەش بڵێن ئامین
وەرن ئەو رووگوڵە سەیری لە حەق من چەندە بێ رەحمە
لە رەغمی من گوڵی رووی کرد بە زولْف و پەرچەمی پەرژین
توخوا روومەت گوڵی نازك بدەپێم وەعدەیی وەسڵت
لە هیجرانت دڵی (عاصی ) دەسووتێ هەروەکوو بەنزین

❊ ❊ ❊

(٣٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

مژدە ئەی دڵ بەستی دووری وا بە وەسلم کردە تەی
موتریبی خۆش لەهجە فەرمووڵیدە عوودو چەنگ و نەی
وا خەریکی سەرفی رووحم گەر بە قیمەت وەرگرێ
مامڵەتم کردووە بە شاهید من لە دڵبەر جووتێ بەی
شەمعی شادیم پێ کراوە کەوتنە جونبوش جان و دڵ
تەن وەکوو تەییارە قوربان هاتە گەڕ پەروانەکەی
جێژنی وەسل ئەی موغەننی لەیل وەعدەی دابە من
مەجنون ئاسا نایفرۆشم قەت بە دووسەد خێڵی حەی
چاوی مەستی مەستی کردم بەوشەرابی عیشقی رووی
چونکە چاوی مەستی مەستی دا بەبادەو پیرو مەی
بۆچی کوێرنابی لە تاوان ئەی رەقیبی سەگ سیفەت
چونکە سەگ مەرگی چە فایدە زیندەگانیت تا بە کەی
حەڵقە گۆشی عیشقە (عاصی) تێبگەن با خاس وعام
قەت غولامیی یار نادەم من بە تەختی چین و رەی

❊ ❊ ❊

(٤٠)

مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

ساقی بدە ئیمڕۆکە بە دڵ شیشە شەرابێ
مەدهۆشە دڵی خەستە لە بۆ دەنگی ڕەبابێ
عاشق دەبێ بۆکوشتنی مەعشووقە نەناڵێ
بێ گریە وو ناڵان و فوغان دەنگ و سەدا بێ
هەر ڕۆژە بە سەد نەعێ دەکا عیشوەوو نازێ
ئەو دڵبەرە ڕەعنایە هەتا ڕووحی فیدابێ
ئەو تیرە لە جەرگی منی دا زەحمەتە یاران
بۆ دەردی منی خەستە چە دەرمان و شیفابێ
تك تك ئەتکێ خوێنی جگەر ئێمڕۆ بە دڵما
وەك ئەشکی سەحەرخیزە بە ئۆمێدی جەزابێ
مەجنوونم و سەرئاسیمە بێ عەقڵ و حەواسم
ساقی وەرە پڕکە بینە بۆم شووشە شەرابێ
(عاصی) لە کەمەندی سەری زولفت کە بناڵێ
کوژراوی خەندەنگی موژەت و تیری بەلابێ

* * *

## (٤١)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

بیحەمـــدیللا ئـــەوا رۆیـــی دلا زســـتانی غـــەمخواری
گەلی عاشق لە گەلْ بولبول دەچـن بـو سـەیری گـولزاری
بەهارە مەوسیمی مەستی لە کۆیی وەسـلی گـولْ ئەنـدام
نەسـیمی سـوبح دەیهێنـیّ لـە گولْـشەن بـۆنی دلْـداری
گولستانی هـەموو سـەحرا بیـساتی عیـشقە هـەر لایـیّ
سەدای نالینی عاشـق دیّ لـە دەوری گـولْ بـە هوشـیاری
تەماشای باغی دلْبەرکەن چلۆن غـەم لیّـوە سەرتاسـەر
بلْـیّن بـا بولبـولی دلْ بـیّ نەترسـیّ هەرگولْـە خـاری
توخـوا دلْبـەر ئـەوا هـاتم بـە ئومێـد غونـچەیی لیّـوت
لە تۆ سەد رەنج و میحنەت بیّ لە من قوربـان وەفـاداری
ئەگەر چی تەرکی کۆی تۆم کرد بە تەن ئـەمما درۆ ناکـەم
دلْـم پەروانەیـە دائیـم لـە دەوری شـەمعی روخـساری
بە پیالەی چاوی هەر مەستم لە خـالی رووی ئەگـەردوورم
ملـم ئێـستاکە هەرقەیـدە بـە داوی زولفـی رەشمـاری

ئەوا هاتم جەفا فـەرموو بـە هـەر نـەوعێ ئـەمن رازیـم
کە چونکە نەبووە قەت نـابێ ویـسالی گـوڵ بـەبێ خـاری
لە ساحەی عیشقی تۆ گۆیە سەری (عاصی) ، وەرەدڵبـەر
بە گۆچانی ئەسـەف لێیـدە ئـەتۆ لـەو ئـەمرە موختـاری

*        *        *

(٤٢)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

ئیلاهی شیشەیی عومرم بە بەردی میحنەتی دووری
شکا پڕژا بە یەکجاری شەرابی کەیف و مەسرووری
تەوەللا بوو دڵی بولبول لە باغی سینەیی بریان
خودا حافیز گوڵم ڕۆیی بە جێما خاری مەهجووری
کە ئای و ئۆیی سینەم دێ لە دەست دەردی فیراقی یار
لە ڕەقسایە دڵی زارم وەکوو دەروێشی شێخ نووری
ئەتۆ ڕۆیی ئەمن چ بکەم چییە دەرمانی دەردی دڵ
گوتی بمرە لە هیجرانا بە زەخمی تیری ڕەنجووری
سپای ئەگریجەکەی کردی هجوومی حوسنی بێ میسلی
دەڵێن ئیمڕۆکە ڕۆژ گیرا بە زوڵف و پەرچەمی سووری
کە سۆفاری برۆی خەم کرد بە عەزمی کوشتنی عاشق
گوتم قوربان وەها نابێ هەتاکەی فکری مەغرووری
گوتم فەوتا دڵم جانا بە خوێنی جەرگی پڕ ئاهم
گوتی (عاصی) عیشقبازی قەدیم هەروایە دەستووری

❊ ❊ ❊

## (٤٣)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەولو)

بە چاوشاهێنی ئەی دڵبەر لە سەییادی وەکوو بازی
لە عاشق دڵڕفێنی تۆ لە ولکەی حوسن مومتازی
فریبت دا بەیەك چاوت دڵی سەد عاشقی وەك من
بەیەك نەشئەت سەری فتنەی عموومی کوردوبن غازی
لەدەست دووچاوی عەییارت دڵ و دینم چلۆن دەرکەم
سەرم کەوتە خەمی زولفت نییە دەرچوون و دەربازی
لەولکەی عاشقانی تۆ ئەمن تاقم وەکوو تاقە
دەخیلت بم وەرە جانا ئەتۆش مەیکە بە فەنتازی
بەچاوی مەستی تۆ مەستم دەکەم حاشا لە مەیخانە
ئەگەر چی دوێنێ سەرخۆش بوون لەوێدا مفتی وو قازی
ئەگەر مەیلت هەبێ قوربان رەقیبی سەگ سیفەت هیچە
سەروماڵم لە بۆ ئەو بێ ئەتۆم مەقسوود و دڵخوازی
کە چونکە دەنگی ناڵەت دێ بەتیری دڵبەرت (عاصی)
هەمیشە مائیلی عیشق و رەباب و سینەمە و سازی

* * *

## (٤٤)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

تولووعی کرد مەلەك تەلعەت خرۆشان ئـەهلی ڕووحـانی
مونـەووەر بـوو هـەموو عالـەم بـەروویی مـاهی تابـانی
سنۆبەر قامـەتێ واهـات مەلایـەك سـوورەتێ دەركـەوت
جەمالی جەزبی عەقڵی كرد هەمووی خـستنە پەرێـشانی
عەجەب لەو سـوورەتە یـاران قەڵـەم تەسـویری كێـشاوە
لـە نەقـشی دووبـرۆی شـێتن هـەزارانی وەكـوو مـانی
كەلەعلی لێوی پشكووتن وەكـوو غونچـە سـەلامی كـرد
هەموو دڵ بوونە بولبول بۆی نەما كـەس زەوقـی جـارانی
بەپیاڵەی چاوی سەرمەست بوون وگوتیان بـابی كەنعانـە
كەسێ یەعقوبی غـەم ریـزە ئـەوا هـات یووسـفی سـانی
بـە چـەتفەی زەردی دایپۆشـی سـەراپا خـاڵ وئەگریجـەی
برینی خـستە جـەرگی مـن بـە ئـەبرۆو تـیری مـژگانی
دڵـم نـاڕوا لـە دەرگـاهی شەهنـشاهی جـەمالی ئـەو
ئەسـیری كـردو پابەسـتە بـە تـای زوڵفـی پەرێـشانی

دڵ و عەقڵی بەغارەت برد بەگۆشـەی چاوتەماشـای کـرد
نیقـابی چـەفیەکەی لادا لــە سـەر خورشـیدی تابـانی
لــە بەرچـاوی حەسـوودانت گـوتم قوربـان وەهانـابی
گوتی(عاصـی) نییـە بـاکم مـنم عوسمـانی عوسمـانی .

* * *

(٤٥)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

وەرن سەیری پەریزادە چلۆن ئەو عیشوە دەنوێنیٚ
بە گۆشەی چاو تەماشاکا حەیاتی ئێمە دەستێنیٚ
کە ئەلفی قامەتی سەروی لە لەوحی دڵ مونەققەش بوو
حیجابی زولمەتی کفرم بە شوعلەی حوسنی دەدڕێنیٚ
دڵم تەیرێکی عاشق بوو لە دەوری گوڵشەنی روویا
بە دائیم هەروەکوو بولبول بە زارونالّە دەخوێنیٚ
لە سەجدەی تاقی دوو ئەبرۆی چەلیپایی سەری زولڤی
سەنەم ناسانی گومڕاهی لەناو بتخانە دەڕفێنیٚ
مەکەن ئینکاری ئەم فەننە وەرن ئەی مفتی وو قازی
شەهیدە عاشقی بیٚ دڵ کە دڵبەر خوێنی بڕژێنیٚ
بە وێنەی فەرقەدان ئیمڕۆ لە دەوری قوتبی خاڵی رووت
دەسووڕیٚ رووحی من دائیم چ وەختیٚ چاوی هەڵبێنیٚ
مەگەر غەوواسی مەعنابیٚ لە بەحری شیعری تۆ (عاصی)
بە چەند جوهدو مەشەققەت بیٚ کە دوڕڕی فیکری دەربێنیٚ

❊ ❊ ❊

## (١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەل مەشتی مەحزووف)

(له جامیعەی سلێمانی ، بۆ خۆشەویستم (دلاوەر سابیر ئیسماعیل) هەولێری لەگەڵ عوسمان بوونە رەفیق بۆ دەرس پێ گوتن. تەلەبەن وله داخلیدا پێکەوەن. هەردوو لا ئەلحەمدولیللا موسڵمانی باشن وقورئانخوێن ونوێژکەرن )

خۆشەویستم نووری دیدە ئەی دلاوەر مەرحەبا
نەونەمامی تازە رسکاو کاك دلاوەر مەرحەبا
پارچە جەرگی کاکە سابیر لێت موبارەك مەنسەبت
خۆشەویستی خۆشەویستم ئەی دلاوەر مەرحەبا
عاقڵ وهەم خوا پەرست و زیرەك و خۆش خوڵقەکەم
ساحیبی عەهدو وەفاکەم ئەی دلاوەر مەرحەبا
تۆش رەفیقی کاکە عوسمان بۆ مەحبەبەت لای ئەمن
مەرکەزی سیدق و سەفا بن هەردوو لاتان مەرحەبا

چـــاوەڕێی لـــوتفی خـــودا بـــن دیـــن و دنیاتـــان دەبـــێ
هـــەر ئـــەدەب بـــێ باشـــیعارتان دووبـــرا بـــن مەرحـــەبا
فیلحەقیقـــە زاتـــی حەققـــە پـــشتیوانی حەقپەرســـت
قۆڕ بەسەر بێ بـاکی ئەحمـەق مـەردی خـوابن مەرحـەبا
هەر دوعـا گۆتانـە (عاصـی) والـە قـاپی بـێ شـەریك
ڕەببی مـەحفوزبـن لـە فتنـە تـا قیامـەت مەرحـەبا .

١١ی ڕەمەزانی ١٣٩٢ - ٩/ ١٠/ ١٩٧٢

* * *

## (٢)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

ئالـــەتی جـــەنگیم هەڵـــستا جونبـــوش وجەولانـــە کـــا
بـــۆ ئۆمێـــدی تۆڵەســـاندن ئـــارەزووی مەیدانـــەکا
هەریەچەشـــنی ســـوورە ماســـی وا لـــە دەریـــای شـــەهوەتا
روو لـــە بـــیری تـــەنگی ئێـــوەی خانـــەدان و جوانـــەکا
دووســـەدو هەشـــتام فـــڕێ دا والەشـــینی شـــێرە کـــەم
تـــێ بگـــەن گیانـــە لـــە ئێـــوە ئیـــددیعای کاڵانـــەکا
لنگـــی رووتـــی وا کـــەدیتن هـــەروەکوو شووشـــەی بلـــوور
روو لـــەرووی چـــەخماخی کـــاف و گەنجینـــەی پەنهانـــەکا
هەڵمـــەتێکی بـــۆ دەبـــاتن وەك پڵنگـــی چـــنگ بـــەخوێن
پەردەکـــەی ئـــەدڕێنی یەکـــسەر دەرکەکـــەش وێرانـــەکا
ســـات بـــە ســـات هـــەر چـــاوەنۆڕی لـــوتفی ئێـــوە وادەکـــا
هـــەروەکوو بەرخۆڵـــە دائـــیم ئـــارەزووی نـــاو ڕانـــە دەکـــا
چـــونکە برســـی و بـــێ مـــرادە چـــەند زەمانـــە رووحەکـــەم
وا لەبـــەربێ رێ و جـــێ یـــی حـــەز لـــە نـــاو زندانـــەکا

بـــۆ دەوای دەردی دەروونـــــی تالـــــەوێ بڕشـــــێتەوە
تـا قیامـەت بـۆی دەگریـە و رووحـی خـۆی قوربانـەکا
شـــێری نێــرە وا لەبێـــشەی عیـــشقی ئێـــوە دائیمـــا
بـــۆ بەهانـــەی ئیـــستراحەت یـــادی چـــوونەلانەکا
وەك کەسـێوی کـوڵمی دیـتن هـەم هـەناری مەمکـەکان
هـــەروەکوو منـــداڵی ســـاوا دەم بـــەدەم گریانـــە کـــا
(عـاصی) شێت بوو وا لە تاوتان ئێـوە رەحمێکتـان نـەبوو
ماچـی سـێوی کـوڵمی ئێـوە دەردی ئـەو دەرمانـەکا

* * *

(٣)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

## وەسفی لەیلەتولقەدر

ئـــەی دڵ شـــەوی بێدارییـــە ئەمـــشەو لـــە جـــەلالا
مەعلوومـــە تەجـــەللا لـــە هـــەموو دەشـــت و جیبـــالا
وا مەوســـیمە ئەمـــشۆکە کـــە بـــێ حـــەزرەتی جبریـــل
پەخـــشانی خەڵاتـــە لـــە تـــەرەف رەببـــی تـــەعالا
پڕنـــــووره دەورودەشـــــت و زەمـــــین وا بەمەلایـــــەك
بـــۆ ئـــەهلی زەمـــین هـــاتووه رەحمـــەت لـــە میـــسالا
واز بێنـــە تـــو ئیمـــشەو لـــە خـــەوی غەفڵـــەت و مەســـتی
نەفـــست وەکـــو دوژمـــن لـــە گـــەڵت وا لـــە قیتـــالا
خـــامۆش مەبـــە لـــەم قـــەدره ئەگـــەر تـــالیبی قـــەدری
خـــەمڵیوه کـــە جەننـــەت بـــە گـــوڵ و عەنبـــەر و لالا
وەختـــێ کـــە نـــەما تاقـــەتی ئیزکـــاری ئیلاهیـــت
سەرمەســـت مەبـــە هـــەر قـــودرەتی حـــەق بێنـــە موتـــالا

فیکــرێ بکــه ئــەی دڵ گــەهی بــۆ ســەنعەتی بــاری
بــاوەڕ بکــه ئــەجرت هەیــە بــیللا لــە خــەیاڵا
ئیمــشەو کــە شــەوی ڕەحمەتــە ئــەو دەرگــە گوشــادە
سەربەست بە لـە ئـەم قاپییـە (عاصـی ) لـە سـوئاڵا .

* * *

## (٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

حەسـرەتا بـۆ دینـی ئیـسلام قـەدرو تەحـسینی نـەما
مـەنهیاتی شـەرع و قورئـان حەیفـە پـەرژینی نـەما
چی بە سـەرهات تـێ بفکـرن ئـەی گـەلی ئیـسلامەکان
ئاسمـانی عیززەتـی دیـن مـاه و پـەروینی نـەما
دەرك وئیـدراکمان نـەماوە ڕۆژەکانمـان هـەر شـەوە
کارەبـای جـادەی نـەجاتمان ڕوون و بـەنزینی نـەما
سەد ئەسەف بۆ قەومی ئیسلام وای لەخۆی کرد حەسرەتا
هەیبـەت و سـامی نـەماوە بـازو شـاهێنی نـەما
چـونکە پـشتی کـردە دیـن و جوولەکـە پـشتی شـکاند
شـێرەکانی سەفـشکێنی دوژمنـی دینـی نـەما
خۆبـە خـۆ لێـك بوونـە دوژمـن هـەر خـەریکی یـەکترن
دڵ تـەوەللا بـوو بـە جـارێ فیکـری ئـاینی نـەما
شا سـوار بـوو قـەومی ئیـسلام بوونـە پیـادە بیلعومـوم
شا کە خۆی مـات بـوو یەقینـە سـوارو فـەرزینی نـەما

کـــەس غـــەمی دینـــی نـــەماوە کەوتنـــە دونیـــایی دوون
دڵ لــە ژێــر پــەردەی قەســاوەت چــاوی دوربینـــی نــەما
ئـــەو دڵـــەی پڕنـــوورو ســـەفوەت مەعنـــەوییاتی هـــەبوو
وا ئـــەویش کەوتوّتـــە شـــیوەن غـــەیری نـــاڵینی نـــەما
چـــارەوو ئیـــسلاحی ئێمـــە وا لـــە دەســـت توّیـــە ، خـــودا
دڵ نـــەخوش و بـــیٚ قـــەرارە ســـەبرو تەســـکینی نـــەما
قـــوٚڕ بپێیـــوە کـــاکی (عاصـــی) تـــاکو مـــاوی هـــەر بڵـــیٚ
داخـــی جـــەرگم دینـــی ئیـــسلام شـــەوق و تـــەزیینی نـــەما

## (٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

**لە سەر داواکردنی عەبدورەزاق و دلشادی کوری حاجی نەجیم تاهیر چەلەبی ئەم مەرسییەم نووسی بە ناوی ئەولادانی، خوسووسەن کوری گچکەی کەناوی سامانە . لەرۆژی (٤٠)ی لە پاش وەفاتی خوێندرایەوە لە مزگەوتی گەورەی کۆیسنجق . لە ئاخیرەوە سێ شیعری عائیدی خۆمە )**

مەرحـــەبا میـــوانی بـــاوکم رۆژی یـــادی رەحلەتـــە
سەد ئەسەف بۆ خانە خوێتـان وا لـە حـوجرەی وەحـشەتە
چاوەکەم یـا خـوا بـەخێربێن پـێ لەسـەر چـاومان بنـێن
خـــاوەنی ئـــەربابی خدمـــەت وا لـــە رەوزەی جەننەتـــە
هـــاتنی ئێـــوە شـــیفایە بـــۆ هـــەموو دەردی دەروون
چـونکە بـۆ ئیمـەی برینـدار دەفعـی دەردو میحنەتـە
وا لەخزمـــەت رادەوەســـتین فـــەرمو گـــەورەو گـــچکەتان
لـوتفی ئێـوە ئـەی عـەزیزان دیـارە مایـەی حورمەتـە
بابـــەگیان میوانـــەکانت چـــاوەڕێی دیـــداری تـــۆن
رووحەکەم تەشـریف بفـەرموو زووکـە قوربـان فورسـەتە

رۆڵــەکانت چـاوە نــۆڕن تــۆش وەرە دیققــەت بکــە
تــاببینی چـاوەکانیان پــڕ لــە ئەشــکی حەســرەتە
دۆســتی ئــەربابی وەفــابووی بۆیەعالــەم خــاس وعــام
بــۆت بــە ئــازارو پەرۆشــن گفتوگۆیــان رەحمەتــە
بــۆ ســەخاو تــەبعی ســەلیمت رەحمــەتت بــۆ دێ هــەزار
میهرەبــانی و دڵنــەوازیت شــەوقی نــووری وەحدەتــە
پاشی تۆ ئەی بابی رووخـۆش کـێ بـی غـەمخواری ئـەمن
دڵ بە کێ خـۆش کـەم بـەقوربان مۆشـکیلێکی زەحمەتـە
خوات لەگەڵ ئەی کاکـە حـاجی کۆچـەکەت یەکجارییـە
وەعــدە بــۆ دیــداری یــەکتر عەرســەگاهی قیامەتــە
داغی جـەرگم دۆسـتی دڵ ساف ئـەی نـەجیبی بـا وەفـا
بـێ ئـەنیس و بـێ رەفیقــی لـەو هـەواری غوربەتـە
نـۆ سـەدو حـەفتاوو دوو بـوو کـاتی دەرچـوونت لـەژیان
چوارده بوو کـانوونی سـانی جومعـە بـوو ئـەم هیجرەتـە
(عاصــی) راوەســتاوە عــاجز دڵ پەرێــشان ومــەلوول
غــــەمزەدەی ونبــــوونی تۆیــــە دەردەداری فیرقەتــــە

* * *

## (٦)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

داد لە دەست مەئمووری ئینگلیز چۆن لـە لایـان سـوننەتە
زولمـی رەعیـە و بـیّ نـەوایان وا لـە ناویـان عادەتـە
پێی دەڵێی مـن زۆر فـەقیرم ئـەی جـەناب بـۆ ریـیّ خـودا
پێـت دەڵـیّ سـکتر بـە ئەحمـەق بیـدە ئـەمری حوکمەتـە
دەرهـەقی رەعییـە و فـەقیران خـۆفی خوایـان قـەت نییـە
ناوچـەوانیان بیلعومـوومی دائیمـا پـڕ سـەتوەتە
بـەعزەکیان چەرچـی زەعـیئن فێـری دۆڵمـەو هـەم پـڵاو
ئێستەکەش دەست کورت و نابوت پاك هەناویان لەت لەتە
وەك سـەدوکەل گەرلەشـوێنیّ بـۆنی شـیویان بـۆ بـچیّ
هـەر لـەوەختی نیـوەڕۆوە ئاغـە مـەیلم خدمەتـە
پاشی مەغریب شـبهی چـاوەش فـێس شـڕو چـاکەت دڕاو
سوورە سوور و دەسـت بـە فـانۆس هـەولی چـایەو دەعوتـە
بـاب و باپیریـان بـڕاوە کـورد زمـان بـوون خـاس وعـام
ئێستە تورکن تـابڵێن هـەر ئـیش بـە دەسـتی حوکمەتـە

ویردو ئەورادیان بە جاریٚ بەحسی ئەغنام و زەکات
شەو لە خەویان دەست دەهێنن وا دەزانن ریشوەتە
بەعزەکیان کۆنن لە زولما میسلی رێوی قەمچوغە [1]
حیلەبازو خوانەترس و زاڵم و بیٚ مروەتە
بۆ تەوازوع زۆر خەریکن دەرحەقی کەبتانەکان
لەفزی ساحیب چاك دەزانن چەند رەوان و سیححەتە
مردنی پیٚ خۆشترە نەك پێی بڵێن هێدی فنش
بیٚ مەعاش گەر سەد توجاربی هەر لەلایان زەحمەتە
بۆ تەشەببوس شاربەشارو دیٚ بەدیٚ عەوداڵ دەبن
ئەی خودا چیت کردلە گەڵ من چۆن بڕام لەم نیعمەتە
نانی کەسبیان لاحەرامە عارە پێیان کاسبی
رووت و قەرزار و تەهی دەست سەیری کەن لەم نەگبەتە
گەر لەبازاڕ دو کولێرەی فرت و فێڵیان دەست کەویٚ
بانگی حەممالی دەکاتن بیبەوە بەو قیمەتە
بۆچی نایبەی خۆت بە گورجی بیٚ عەقڵ بۆ وادەکەی

---

[1] قەمچوغە گوندێکە لە ناحییەی سورداش لە تەنیشت دوکان . وا دەگێڕنەوە کابرایەك راوچی بووە کەوڵە رێوی لە ماڵی هەڵاوسیوەو رێویەك فێرببوو شەو دەچووە ناودیٚ مریشکی دەخوارد. بەرۆژ دەهاتەوە لەناو کەوڵە رێوییەکان خۆی هەڵدەواسی . هەتا رۆژێك مشتەری هات. کابرا کە چوو تەماشای کرد کەوڵێك زیادە لە حسابی خۆی کە دەستی دانیٚ رێوییەکەی دیتەوە کە ئەوە زیندووە ، گرتی سەری بڕی ، ئیتر مریشك خواردنی شەونەما . (عاصی )

ئانـــەدان بۆچـــی بـــە حـــەممال ئیحتیـــاجی زەحمەتـــە
عیبـــی یـــوك عـــادت مـــزی هـــر بویلـــە در [(١)]
احتیـــاج مـــز اصـــلا یـــوکتر سـایە نـــزدن دولتـــە[(٢)]
ئـــەی درۆزن بـــۆ قرۆشـــیّ کێـــچەکانت گانـــەدەن
ســـویلەمم یالانـــە جـــانم ســـویلرم بـــن صـــحتە[(٣)]
(عاصـــی) وازبێنـــە لەوانـــە هـــەر دوعـــای ئیـــسلاح بکـــە
دەرحـــەقی خـــۆت و ئـــەوانیش خـــوا بەفـــەزل و رەحمەتـــە

❊ ❊ ❊

[١] تورکی
[٢] تورکی
[٣] تورکی

(٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

بـــۆ کەســێکی پــڕ شــعوورو ئــەهلی زەوق و دەیققەتــە
تــێ دەگــا گــەر شــاری کۆیــە یــەك نموونــەی جەننەتــە
گوڵــشەن و گــۆلزارە دەوری فەســلی هــاوین و بــەهار
پــــایزان بازاڕەکـــانی پـــڕ لــــە خـــوانی نیعمەتــــە
واریــــداتی چەشــــنی بـــاران ســــادیرە وەك تەرزەیـــە
ئاخ لەبۆ یەك مەردی غــەمخوار بــۆ ئــەدای ئــەم خزمەتــە
دەورەکـــەی وەك لانـــی شــێرە پــشتی هێلانــەی پڵــنگ
پیــــاوی عـاقــڵ تــێ دەگـــاتن زەحمەتیــشی رەحمەتـــە
زۆر سەخی تەبع و ڕەشیدن هەر وەکوو حاتــەم هــەمووی
ڕۆژی لیقــەومان تەماشــا گــشت شــیعاریان هەڵمەتــە
عـاقــڵ و هۆشــدارو زیــرەك قــسمی منــداڵی هــەمووی
نێرو مێــی هــەردوو شــەریفن غایــەیان هــەر عیسمەتە
گـــــردی بــــاواجی نموونــــەی کێـــوی لبنانـــە بـــرام
مەرقــەدی ئەییوبــە ســـولتان پایتــەختی هەیبەتـــە

دڵنـــەوازن بـــۆ غـــەریبان ئـــەهلی ئینـــسانن هـــەموو
شـــێری مەســـتن ڕۆژی قـــەومان ئارەزوویـــان هەڵمەتـــە
(عاصـــی) وازبێنـــە عـــەزیزم بێکەســـە تـــۆ شـــارەکەت
بۆیـــە دائـــیم کـــونجی ســـینەت پـــڕ لـــەداخ و حەســـرەتە

* * *

## (٨)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

**لەوەختی شێخ مەحموود لە ئەشکەوتی جاسنەی دابوو، ئینگلیس بە تەیارە بوردومانی دەکرد ، ئەمن لە دێی سارتکە بووم. هەموو رۆژ ئاگاداربووم تەیارە دەهات. لەتاوان ئەوەم نووسی**

فەلـەك شـینە لەبـەر شـیوەن مەلـەك پـڕ زارە لـەم زارە
زەمین سەوزە بـە تـۆوی غـەم لـە بـەر ئـەم هـات و هـاوارە
کەوا نەسلی رەسـوولە لـلا غـەریقی بـەحری حەسـرەت بـوو
خودا ، کەشتی نـەجات بـابێ لـە بـۆ ئـەم شـۆخە سـەردارە
بنێرە نـووحی لـوتفی خـۆت سـەفینەی شـادی هەڵبەسـتێ
لـە سـەرجوودی سـلێمانی قرارگیربـێ کـە ئـەم جـارە
کەرو سیك و سەگ و سۆجەر ، تەیارە وقونبولەو شەست تـیر
هەمووی خڕبوونەوە یەکسەر لـە سـەر ئـەم شـاهە نـازدارە
دەخیل ئـەی دەوڵـەتی ئیـسلام هەتاکـەی مـات و بێـدەنگی
کەمـەحموود چـەندە مەغـدوورە بنێـرن تـۆپ و تـەییارە
مەلا و دەروێش و سۆفی و شـێخ ، غەزایـە بۆچـی وەسـتاون
مەزاتـە جەننەتولئـەعلا بـەروح هەرکـەس خەریـدارە

لەولکـەی میللـەتی ئیـسلام کـەریم بـەگ سـادیقولوەعدە
دەتـوانم شـاهیدی بـۆ بـدەم لـە ریـزی قـسمی ئـەبرارە
عـەلی شـێری خـودا کـوانێ قەڵاکـەی خەیبـەری رووخانـد
کـە شـێخ مـەحموودی کاکـە حمـەد گرفتـاری سـەگی هـارە
قوماندان عەسـکەرو زابـت ، سـەرم قوربـانی سـەرتان بـێ
مەترسێن دوژمنی دینمـان هـەمووی مـەیموون و سەگسارە
بە روپیەو نـۆت و ئانـەو فێـڵ کـڕی غـیرەت بـە یـەکجاری
سـیلاحی دینـی دەرهێنـا لـە دەسـت ئیـسلامی بێـچارە
دەخاڵـەت ئـەی عەشـایرها بکێـشن غیرەتـێ ئێـوەش
کە شایەد نوتفەیی ئەحمـەد نـەجاتی بـێ لـە ئـەم غـارە [1]

* * *

[1] لێرە لەتێکی زیادی نوسیبوو : ( بناغەی عوشرەتی تێکدا بە بۆمباو تۆپ وتەییارە)

(٩)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

تەماشـاکەن دڵـی ریـشم کـە چـەند سـالارو شەهـسوارە
لە مـەیدانی غـەم و حەسـرەت خـەریکی قۆشـمـەوو غـارە
ئەسـیری نـەفس و شـەیتانە تەمـاعـە زیکـرو ئـەفکاری
لــە خەڵوەتخانـــەیی حیرســا خـــەریکی ناڵـــەوو زارە
ئەگەرچی عومری رۆیشتووم لـە دەوری سـاڵی هەشـتایە
لـە بۆتـوولی ئەمـەل ئێـستاش دەڵێـی منـداڵی پێـرارە
ئەوەند مەغروورو بێ باکە چە ئاگـای لـێ نییـە عـومری
لە سەرجادەی حەیاتی خۆی لە سـەییارەی ئەجـەل سـوارە
خەیاڵی لێ بکە بێ هـۆش کـە ئـەووەل مـەنزیلت کوێیـە
دەروونـی قـەبری تاریکـە ئـەویش گـوڵزارە یـا نـارە
کە هاوناوی حەبیبی تـۆم ئیلاهـی مەرحەمـەت یـارەب
بـە تـیری جیفـەیی دونیـا جگـەرپارە و برینـدارە
چ فیکرێکـە ئـەوا (عاصـی) ئـیتر بەسـیە حـەیا بگـرە
خـەریکی رێـی نـەجاتت بـە لەحیلـەی نەفـسی ئـەممارە

❊ ❊ ❊

(١٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

## بۆ حەفلەی حاجی قادر

( شەوی حەفلەکە ، لە پاش خوێندنەوەی وتارو هەڵبەستەکەم ، کە چاوم بەرێك و پێکی حەفلەکە کەوتو زۆربە تەرتیب رازایەوەو زیاد لە مەقسوود جوانتر هاتە بەرچاوم کەوتمە فیکری ئەوەی کە گفتوگۆیەکی تر لە گەڵ حاجی قادر بکەم و ئەو هەڵبەستە وەکوو نووسراوە بە دڵما هات وچۆی کرد هەتا سبەینێ نووسیمەوە . )

سەربڵند کە حاجی قادر سەیری جێی حەفلەت بکە
بووە نمونەی باغی جەننەت فەرمو تۆش عوشرەت بکە
تۆ لە ئەستەنبول کە مردووی لێرە زیندوو بوویەوە
ئافەرینی ئەهلی کۆیەی با وەفاو مروەت بکە
وا لەپێناو شوهرەتی تۆ هاتنە مەیدانی سەخا
ڕەسمی ئیخلاسی بە جێ هات شوکری چەند نیعمەت بکە
بۆسروورو دڵنەوازی دەم بەخەندە رووکە گەل
مەرحەبای میوانەکان و هاوبەشی میهنەت بکە

سـەیری ئـەم گوڵزارەناکـەی بـۆ ئـەتۆ رازایـەوە
لاوەکانمـان بوونـە غیلمـان مـەیلی یـەك شـەربەت بکـە
بێـرە سـاحەی حەفلەکـەی خـۆت تـابیینی حورمـەتت
سەیری شانۆ و مێزوکورسی و رەسمـی پـڕ هەیبـەت بکـە
پیرو جوانمان هاتـە سـەیری ، مامـە حـاجی هەسـتە پـێ
باش تەماشای تەخت و بەخت و زینەت و شـەوکەت بکـە
حوورو غیلمان و قوسـوورە ، چـاو بڵندکـە مامـە گیـان
بۆ شعووری قـەومی کۆیـە هـەر دوعـای عیـززەت بکـە
زۆر بـە دیققـەت بـۆ تەماشـا چـاو بڵنـد کـە چـاوەکەم
دەم بەخەندە و پێکەنین بـە روو لـەرووی جەننـەت بکـە .
سازوسەمتوورو موغـەننی شـیعری پـڕ مـەعناو بەسـۆز
فەرمو گوێ بگرە بە قوربان روو لە رووی میللـەت بکـە
نـاوی تۆیـان کـردە بەیـداغ والـە لوتکـەی چیایەکان
بای مەحەببەت ڕایدەژێنێ تـۆش دوعـای نەسـرەت بکـە
ئـەم مەکینـە یـادی تۆیـە واشـەوی کردۆتـە رۆژ
فـەرمو ئـەژمارەی گلـۆپی کارەبـای نـەدوەت[1] بکـە

[1] نەدوەت : مناداة الله . (عاصی )

بـــۆ تـــەرەققى شــــارى كۆيـــە تـــا فەلـــەك دەورانـــەكا

روو لـــە ميحرابـــى دوعـــاوو بارەگـــاى وەحـــدەت بكـــە

زۆر رجايـــە كـــاكى كـــوردى ئـــەم رەوشـــتە تێـــك نەچـــێ

كورد بە تـــا دونيـــا دەمێنـــێ خـــاك و ديـــن خزمـــەت بكـــە

من لە خوام داوايـــە حـــاجى لێـــت ببـــوورێ هەرچـــى بـــوو

ئيدديعاى روتبەى شەهادەت تۆش بە رێى غوربەت بكـــە

(عاصـــى) حەيرانـــە لـــە وەسـفت چـەندى بيلـێ زيـاترى

سەد ئەســـەف كـــەلكى نـــەگرتى چـاوەڕێى ڕەحمـــەت بكـــە

١٢ ى (جمادالاول)ى ١٣٩١ — ٦ ى تەمموزى ١٩٧١ — ٢٣ ى حوزەيرانى شەرقى

❋ ❋ ❋

## (١١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

ئـەی خودایـە تـاکو مـاوم سـست و بـێ تـەقوام مەکـە
بیکـە خـاتری فـەخری عالـەم کـوێرو نابینـام مەکـە
تـەن زەبوونـەو پـیرو بـێ هێـز، بـێ نـەواوو دەردمەنـد
موستەحەققی رەحمـەتی تـۆم بـێ بـەش و هیـوام مەکـە
چـونکە نـاوم مـستەفایە ئومـەتی خەیرولئـەنام
شەرمەساری زاتـی خـۆت و هـەم رەسـووله لـلام مەکـە
شـاهیدی مـن تـۆی خودایـە بێ شـەریکت پـێ دەڵـێم
تۆش خـودا مـەحروومی رەوزەی حـەزرەتی تاهـام مەکـە
زۆر پەشـێمانم لـە فیعـل وکـردەوەی ناپـاکی خـۆم
لـێم ببـوورە یـا ئیلاهـی روورەش و رسـوام مەکـە
خـۆت دەزانیـت چـەند مەراقمـە زیـارەتی بەیتولحـەرام
بـێ تـەوافی کەعبـەتوللاو زەمـزەم و مینـام مەکـە
بیکە خـاتری دینـی ئیـسلام رێـم بـدە بـۆ مەککـە بـێم
بێ سەوابی چوونی عەمرە و هـەم سـەفاو مـەڕوام مەکـە
نـووری چـاوم لێ مەسـێنە یـا سـەمیع و یـا بەسـیر
ئـەی خـودا دووبـارە دەیڵـێم کـوێرو نابینـام مەکـە

بۆ بەجێ هێنانی ئەمرت بەڵکو بێ قووەت نەبم
رووڕەشی رۆژی حیساب و بێ وەفای دنیام مەکە
مەمکە ژێر دەست و ئەسیری نەفس و شەیتانی لەعین
غەرقی گێژاوی عەزابی ئاگری (لظّی) م مەکە
خۆ دڵیش بێ هێزە چاوی دەرك و ئیدراکی کەمە
بێ موبالاتم لە زیکری ئیسمەکەی ئەڵلاّم مەکە
تا حەیاتم ماوە یارەب عەقڵ وفیکرم تێك مەدە
شێت وسەرگەردان و بێ هۆش وێڵی ناودونیام مەکە
دیار بە دیاری پێکەنینی غونچەیی سوبحی ئەمەل
تووشی حیرسی هیچ و پووچی بولبولی شەیدام مەکە
وەختی نەزعم پێم کەرەم کە فەزلی حوسنی خاتیمە
بێ نسیبی نیعمەتانی جەننەتولمەئوام مەکە
لێوە شاوەی سەرزەنشتی ئەولیاو چاکان نەبم
هەم خەجاڵەتمەندی شاهی یەسریب و بەتحام مەکە
مەخە ناو کوورەی جەهەننەم شان بە شانی کافران
سەرنەوی و چاوشۆڕی قەومی جوولەکەو تەرسام مەکە
(عاصی) رووی کردۆتە قاپیت هەر دەگریەو هەر دەڵێ
تووشی دەردی بێ عیلاجی و عیللەتی سەودام مەکە

* * *

## (١٢)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

گـەلی یـاران چـریکێك دێ حەقیقـەت دەنگـی سـترانە
زرارە ئەسـڵەحەی هـەڵگرت شـەڕێکی کـرد دلێرانـە
هـەزاران سـەنگەری تێکـدا شـکاندی لەشـکری ناحـەز
گەلێکیشی ئەسـیر کـردن کـە جێیـان چەشـنی زیندانـە
دڵی خاڵی لە عیشقی حـەق حەقیقـەت ئیـشی نائەهلـە
ئیتاعـەی حـەزرەتی (الله ) خـەلاتی ئـەهلی ئیحـسانە
ئەگـەر چـی عیـشقی ئەگریجـە لـە ئـاگر تیـژترە یـاران
لە سەر رێگای خەتەر لادە کـەجێگات قەسـری عەدنانـە
لە رێگای دینی حەق(عاصی) چە جارێ لای نـەدا یـاران
خـــەلاتی عیززەتـــی دایـــە [1] ........................

* * *

---

[1] ئەم لەتەی کۆتایی لە دەستنووسەکەدا ئاوها بە ناتەواوی ماوەتەوە.

## (١٣)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

بە فرمێسکی پەشێمانی بکە تاعەت گوناهی زووت [1]
تەماشای هەوری ڕەش ناکەی کە قەترەی چەند سپی و جوانە
هەموو عومرت لە دەست ڕۆیی قسەی نەرمت نەبوو هەرگیز
لەئەم بێ خولق و ڕووگرژیە چ بوو نەفعت ئەتۆ گیانە
حەیات بۆچی نەکرد جارێ حەیاتیشت لە دەست دەرچوو
ئەتۆ نەتبیست نەبی فەرمووی حەیا شوعبێکی ئیمانە
وەکوو کەشتی شکاو دنیا لەناو بەحری حەوادیسدا
کەبۆ خۆی حاڵی ئەوها بێ تەلەب کاری پەشێمانە
دەخیلت بم لە بۆ نانێك مەڕێژە ئاوی ڕوخسارت
کە ئاوی ڕووت لە جێی خۆی ما بزانە ئاوی حەیوانە
ئەگەر عەقڵت لە دەست دەرچێ بەلایە نەفسی ئەمارەت
لە دوای ویش (عاصی) وریابە لەوی پیستر کەشەیتانە
لە بەرباوو بڕی نەفست چراغی دڵ پەنادە زوو
هەمووی پێچ و پەنایە ڕێت هەمووی هەرچاڵ و زندانە

---

[1] ئەم قەسیدەیە دێڕی یەکەمی،کە موسەررەعە،سڕاوەتەوە.

ئیتر قەت مەیدە دەست نەفست لغاوی ئیختیاری خۆت
چەرێی چاکت نیشان نادا ئەمە هەر نەسسی قورئانە
بە زەیتی زینەتی دنیا دڵ و رووحم وەها سووتان
سەراپا بوونە خاکستەر عەجەب لەم دەورو دووکانە
وەرە بن سێبەری عیززەت بکە کەسبی قەناعەت تۆ
کڵاوی بێ نەوایی خۆت لەوێدا تاجی سوڵتانە
ئەگەر مردی بەمەردانە بچۆناو بەحری هوشیاری
بە چاوی دڵ تەماشاکە خەزێنەی دورڕومەرجانە
شعوورت تێك مەدە عاصی لە کیس خۆتی مەدە مەرد بە
دەبێتە شاهیدی فەزلت هەموو ئەم رەمزو بورهانە
دڵی رووناك و باتین بین چە چاوی زاهیری ناوێ
هەموو مینابی گەر خانوو چە پێویستی کولانکانە
دڵی هوشیار لە ئەم بەحرە وەکوو کەشتی جەنابی نووح
لەسەر جوودی ویسالی حەق ئومێد و عەزمی وەستانە
وەرە (عاصی) ئەتۆ مەرد بە بچۆ زندانی خامۆشی
لەوێ مەعلووم دەبێ بۆ تۆ کە فەوقی قەسری شاهانە

* * *

(١٤)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

## ئەوەش بۆ موئەززینانی وەختی بانگی سبحەینان بیخوێننەوە بۆ موسڵمانان

موسـڵمانان لـە خـەو هەسـتن ئـەوا وەختـی هەڵـستانە
تەماشـای فـەجری سـادق کـەن لـە ئاسمانـا چـراخانە
مەلەك سەف سەف ئەوا هاتوون لە دەرگەی مەعبەدی ئیسلام
بـزانن کـێ موهەییایـە کـە وەختـی ئـەمری یەزدانـە
دەخیلـە ئـەی بـرای دینـی لـە خەوهەسـتن بـەیانی دا
لـە خزمـەت حـەزرەتی بـاری خـەڵات پەخشانی غوفرانـە
ئەوەی هەڵناسـی مەعلوومـە لـە رەحمـەت بـێ بەشـە بیللا
لـە قیامـەت بـێ بـەش و رووڕەش گـەلێ رسـواو پەرێـشانە
ئەوەی بێباکـە لـەم وەختـە ئیتاعـەی حـەق نـەکا مـەعلووم
بـزانن ئـەو کەسـە دائـیم ئەسـیری نـەفس وشـەیتانە
تەفەککور ئایە قەت ناکـا لـە حـاڵی خـۆی لـە دوای مـردن
لـە تۆڵـەی ئـەم خـەوەی ئێـستا عـەزابی قـەبری زندانـە
رجاتان لێ دەکا (عاصی) بە خۆتـان خـۆش مەکـەن شـەیتان
خـەوی ئێـستا بـە بـێ بـاکی وەزیفـەی جوولەکـەو دیانـە

* * *

(١٥)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

## لەو وەختە کە بەرقیە هات فەیسەڵی ئەووەل بووە مەلیك ، خوتبە بەناوی ئەو بخوێندرێتەوە ئەوەم نووسی

لــــە تـــاریخی چـــلودوودا کـــە ئـــاخیر مـــانگی زســـتانە
بەرۆژی جومعە ئیمرۆکـە کـە هەشـتی مـانگی نیـسانە
خرۆشـــا عالـــەمی ئیـــسلام بـــەهاری شـــیوەنە یـــاران
کەتێلـــچی وای خەبـــەر داوە بـــە مـــەئموورانی تێلخانـــە
خەلیفەی عالەمی ئیسلام نـەما تـەخت و جـەلالی ئـەو
لە سەر مینبەر بکەن ئیفشا مەلیك فەیسەڵ کە سوڵتانە
تەحـــەییور بـــوو دڵـــی زارم ســـەرم دەرناچـــی لـــەم رەمـــزە
لـــەلایێ شـــیوەن و شـــینە لـــە لایـــێ بـــەزم و ســـەیرانە
لە لایێ ئەشکی خوێن دەڕژێ لەدیدەی عالـەمی ئیـسلام
لـــە لایـــێ دەنگـــی موتریـــب دێ لـــە نـــاو بـــازاڕو چـــاخانە
گەلەکیان خوارو گەردەن کەچ تەمەننای روپییەیە دیکـەن
بە ساحیب ساحیبی کافر لە نـاو مـەئموور شـەڕی نانـە

ئومــــووری دوژمنــــی دینــــه لـــه هـــەرکۆلآنی دەبیبیــــنم
درۆو بوختان و حیلەو فیـّـلّ لــه هــەر لایــیّ کــه ئیعلانــه
موناجات کەن گــەلی ئیـسلام لــه قــاپی قــازیی لحاجـات
ســەدای ( لاتقنطــوا ) یادکــەن کــەلامی زاتـــی یەزدانــه
له پاش عوسرەت یــەقین یوسـره دەلیلــه ئایــەتی قورئــان
کلیلـــی دەرگــەیی خۆشــی حەدیـــسه ســـەبری ئینــسانه
له بەرچــی عــاجزی (عاصــی ) درۆ بــیّ چــارەیه قوربـان
لەدەست حیزان گەلیّ حیــزه خوســـووس ئیّـــستا پەریّـشانه

* * *

## (١٦)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

موسـڵمانان تەماشـاکەن لـە بەرشـیوەن فەلـەك شـینە
کـە کـاتی تەعزیـەو ناڵـەی شـەهیدانی فەلەسـتینە
نەقـەوماوە هـەتا ئیمـڕۆ چ کاتێـك جێژنـە بـەم چەشـنە
لە خاکی چوار حوکوومەتدا سـەدای گریـان و هـەم شـینە
لە شام و میسرو ئەردەندا لەگەڵ قەومی عیراق هـەر چـوار
لە حەسرەت خزم وئەو لادی هەمووی فرمێسکی خوێنینـە
لـە بـاتی موسـیقاو شـایی لـە خـاکی غوربـەتا ئیمـڕۆ
لە ناو خوێناوی خاك و خـۆڵ خـەریکی مـەرگ و گەوزینـە
غـەمی گـەورەم ئـەمن یـاران کـەوا ئـەولادی کوردسـتان
ئەسـەف ئـەو بەچـکە شـێرانە ئەسـیری دەسـتی ڕێوینـە
هـەتا مـابم لـەبیر ناچـێ لـە پێنـاوی کەسـیك فـەوتان
کە دەرحـەق میللـەتی کـوردی وەکـوو دەعبـایی کیوینـە
لە تاوی میللەتی ئیـسلام لـە دەسـتی جوولەکـەی ناپـاك
لـە هـەر ئاسمـان تەماشـاکەی مەلـەك گریـان و ناڵینـە

تو خوا ئەو دایك و بابانە چلۆن دەژیەن بە ئەو حاڵە
کە پارچەی جەرگی نازداریان رەزیلی دەستی بێ دینە
وەرن ئەی میللەتی ئیسلام بەناوی دینەوە هەستن
عەرەب یا کوردو یاتورکە ئەوەی یەك دینوئایینە
ئەگەر بێت و پەلامارتان لەسەر بەیتولموقەددەس بێ
بە قورئان جووی دەفەوتێنن کە چونکە غایەتان دینە
بە چاو زۆرچاك تەماشاکەن سەراپا خۆ لە قوڕبگرین
یەهوودی ئاگری سوورە موسلمان چەشنی بەنزینە
نیە چارتان بە هیچ جۆرێ بە غەیرەز قووەتی دینی
ئەگەر خوا پشتیوانت بێ مەترسن دوژمنی دینە
هەموو ئینگلیزو ئەمریکا لەگەڵ رووس و لەگەڵ جوودا
بەرابەر هێزی دینی تۆ ئەوانە گشتی خوێڕینە
لە دەرحەق ئێوە ئەی ئیسلام هەموویان خائنی بەدخوون
خەریکی خاکەکەی تۆنە ئەگەر غەربیی و شەرقینە
دەماغتان بێنەوە سەرخۆ ئیتر بەسیە لە حەق لادان
رەزیل بوونتان لە دەستی جوو عەزیزم تۆڵەیی دینە
لە ئادابی دیانەتدا بە نێرومێوە لاتان دا
حەیات و هەم حەیاشمان چوو حەیا گەنجێکی زێڕینە

لــه شــێوەی پیــاوەتی لادان لــه شــێوەی کوردییــەت دووره
ئیتر ئەی کوردە تۆ بۆچــی بــه شــوێن ئــەو شــێوه کەوتینــه
تەماشای رەسمی شەترەنج کەن لەسەر دەستووری کوردییەت
ئەوانــه گــشتی هەرداشــن کــه کــوردیش شــاه وفەرزینــه
ئەوەی ئەسبابی راستی بێ بەکوردی پێی گوتن (عاصــی )
بەوردی دیققەتی لێ بکــەن لــه تــاو ئێــوه چــه غەمگینــه

(١٧)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

## پاڕانەوە لە خوای تەعالا بۆشیفای چاوەکانم چونکە گەلێ بێ هێزبوون

لە قاپیت عاصی وەستاوە لە ترسان جەرگی پڕخوێنە
دەزانی چی دەوێ یارەب دڵی ئەو پیرە مەشکێنە
دەڵێ من بێکەسم بێکەس عیلاجی بێکەسان هەرتۆی
خودایا مەرحەمەت فەرموو بەرەحمەت ئیشی پێك بێنە
کە خۆت فەرمووتە داوا کەن لە قاپی بارەگای رەحمەت
بە حەققی فەخری ئینس وجان جەلای چاوم مەفەوتێنە
خودایا چاوی یەعقووبت بەیەك پارچەکراس چاکرد
وەسیلەی من کە قورئانە ئیلاهی لێمی مەستێنە
شیفا بەخشی حەقیقی تۆی شیفای هەردووکی بۆ بێنە
سوئالت لێ دەکەم یارەب بە حەققی حورمەتی قورئان
دەوای قودرەت بە ناوچاوما بەقەترە فەرموو بڕژێنە
هەتا ماوم بە هەردوو چاو تەماشای خەتتی قورئان کەم

خــودا قورئــان تــەبیبم بــیٚ ئــەتۆش تەئــسیر ......[1]
گەلێکم حەز لـە رووناکیـە خـودا تاریـك نەکـەی چـاوم
پڕپـشکی نـووری تەوحیـدت بـە سـەر دڵمـا بپرژێنـە
رەزیلیشم نەکـەی یـارەب بـە هـیچ نـەوعیٚ هـەتا مـاوم
دڵ و جیـسموهەموو قـەلبم بـە بـیٚ هێـزی مەرەنجێنـە
بە حەققی فەخری عالەم کەی قبوولٚی کەی دوعاو نووزەم
بـە سـاغی دیـن و دنیامـا نیهایـەی عومرەکـەم بێنـە
لە سوورەی نوورە فەرمووتـە کـە نـووری ئـەرزو ئاسمـانی
بەدەن شایانی میشکات بـیٚ دڵـیش شووشـێکی خاوێنـە
لـە تـۆم داوایـە یـارەببی چ کـەم نابـیٚ لـە نـووری تـو
بـە زەرڕێکـی لـە ئـەو نـوورە گلـۆپی دڵ بئایـسینە
لە قەبرا بەڵکو روناك بیٚ بە قـووەی کـەهرەبای قـودرەت
خـودا دووبـارە وا دەیلـێم دڵـی ئـەم پـیرە مەشـکێنە
لە بەر خاتری دو ئیسمی خۆت سەمیع و هەم بەسیر یارەب
نـەگوێم کەڕکـە خوداوەنـدا نـە چاویـشم بفەوتێنـە
لـە دڵمـا نـووری ئیمـانم ببێتـە کەوکـەبی دورڕی
سـەفا قـەلبی دەویٚ (عاصـی) بەوێنـەی بـەرقی ئاوێنـە

٢٢ ی ربیع الثانی ی١٣٩٣ ، ٢٦ /٥/ ١٩٧٣

❊ ❊ ❊

---

١- وشەی کۆتایی ئەم لەتە نەنووسراوە.

## (١٨)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

تەماشای چەرخی چەپگەرد کەن بە زیددی چەرخی گەردونە
ئەوەی شایانی عیززەت بێ ئەوێستا سووك و مادوونە
هەواو دەستووری نائەهلە بناغەی حورمەتی تێك دا
وەتەن شێواوو پڕ حەسرەت ئەهالی زار و مەفتوونە
لە چۆل و دەشت و هەم چیادا تەماشای خوێنی کوردی کە
لە گەڵ فرمێسکی باب کوژراو دەڵێی رووباری جەیحوونە
حەرەس قەومی کە وەختی هات بەلینگی رووت و بێ دەرپێ
لە راستی کوردی بێچارە دەڵێی مەڕوان و مەئموونە
خیلافی ئەمری یەزدانە هەموو رەفتار و ئەفکاریان
ئیدارەو حوکمی بێجێیان خیلافی شەرع و قانوونە
ئەگەر چە راستە دووپێنە بە وەحشەت فەوقی چوار پێنە
بە عەقڵ و سوورەت و سیرەت هەمووی سەگسار و مەیموونە
زەرەرمان هیچ نەکرد ئێمە کە چونکە تێگەیشتین باش
بڕینی پەنجەیی کورتی کە چەند پڕ ئێش وکەسکوونە
بە هیوای تۆڵە وەرگرتن کە سەرفی ڕووحی شیرین کەین
ئەوا فەرهادی سەردارمان خەریکی کێوی بێستوونە

ئەگەر فیرعەونی میسریش بێ زەریف با تێ بگا بۆخۆی
سیلاحی کوردی ساحیب حەق عەسای مووساوو هاڕوونە
دەبێ هەر خۆی بخنکێنێ لە گێژی بەحری حەسرەتدا
لە دەستی چوو کە خاکی کورد هەمووی هەر گەنجی قاروونە
سەرت دەرکە هەتا ماوی بەرێگای فورسەتا ڕاکە
شیمال هەرموڵکی کوردانە ئەتۆش چارت بەلاچوونە
زەریفی تێ بگە یابەوەکوو حەڵقە لە گوێتی کە
میسالی نیشتمان و کورد وەکوو لە یلاوو مەجنوونە
وەتەن خاوێن و بێ غەم بوو بە زوڵمی ئێوە چڵکن بوو
لە بۆ شۆرینی بڕنەومان گەڵی باشتر لە سابوونە [1]
ئەگەر حەسرەت دەخۆی بۆ نەوت بڕۆ هەندێك بە سەرتاکە
بەکارنایە درۆ و تەفرە بەڕاستی وەختی دەرچوونە
لە شوومی زوڵم و بێ ڕەحمی لە دەرحەق نیشتمان و کورد
بناغەی هێزی ناحەقتان بەرەو رووخان و تێکچوونە
بیحەمدیللا کە ناوی کورد بەناوی ئەو کەسەی دەرچوو
بەغیرەت کێوی ئەلبورزە بە هیممەت پیرە مەگرونە
منیش هاوناوی ئەو زاتەم وەلاکین شوهرەتم (عاصی)
بەتیشکی رۆژی سەرکەوتن قەریحەو زهنەکەم روونە .

* * *

---

[1] لە پەراوێزدا نووسراوە : (لە بۆ شوشتنی گوڵەی بڕنەوگەلێ باشتر لە سابوونە).

(١٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## لەوەختی مەلا عەلی هاتەوە نەخۆش بووم ئەوەم نووسی

وەك بــە خۆشــی کەوتــە بــەرگوێم وابــرام هاتۆتــەوە
بـــێ درۆ بـــاوەڕ بفـــەرموو چـــاوەکەم روون بۆتـــەوە
سەیری لەم کاتە نەخۆشی چی لە من کرد سـەد ئەسـەف
نەیـــدەزانی فەســـڵی گـــوڵ هـــات بولبـــولم هاتۆتـــەوە
مـــژدە بـــێ دیـــداری ئێـــوە عـــومری تـــازە کردمـــەوە
شەربەتی وەسڵی کە نـۆش کـرد بـاش بـەخۆ کەوتۆتـەوە
بەختی بەرگەشتە ئەگەرچـی روو بـەرووی خـواری دەچـێ
سەد شوکر وەك سەروی رەعنـا سـەربەخۆ راسـت بۆتـەوە
چـــەرخە خـــۆی وا بـــا ئـــەداتن قـــادری قـــودرەت نمـــا
لوتفی خـوا دڵمـی بـە ئـاوی مەرحەمـەت شووشـتۆتەوە

سـورمەیی خـاکی قـەدەمتان روونـی کـردووە چـاوی دڵ
گەر چـی بـێ کـەیف و زەعیـف بـوو قـووەتی گرتۆتـەوە
چـاوەکەم ئێـوەم سـەلامەت قـەت ئەجـەل چـاری نییـە
بـۆ بەسـەرهاتی زەمانـە زوو قەڵـەم وشـك بۆتـەوە
فیلحەقیقە من کە (عاصی)م قەت لە تۆ عاصی نەبووم
زوو بـەداوێکی مەحببـەت بـاش دڵـم بەستۆتەوە

١٩٧٥/٥/١٤

❊ ❊ ❊

## (٢٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

### ئەم شیعرانە لە تەئریخی ١٣٤٠ ی هجری دامنابوو لە لام نەمابوو . وا نووسیمەوە . ئەو وەخت مەکتەب تازە پەیدا ببوو

بەسـیـەتی ئـەی قـەومی کـوردی بـا وەتـەن نەبڕێتـەوە
ئـاگری ئاسـاری میللـەت چـاك وەیـە نەکوژێتـەوە
بـۆ خەزێنـەی عـیلم و عیرفـان جەهلـە ڕێگـەی گرتـووە
دەرکـی دیـوانی شـەفاعەت بـۆ لـەکورد نەکرێتـەوە
ڕووحـی دنیـا خـاکی کـوردە باعیـسی ژینـی هـەموو
چـاکە دەرگـەی عـیلم و عیرفـان بـا لـەناو بکرێتـەوە
خۆڵەمێـشی خـاکی ئێمـە بۆتـە جەوهـەر بـۆولأت
حەیفە بـا ئـەو مەعدەنانـە قـەت لـە کـورد نەشـرێتەوە
بـا چـوغەی شمـشیری غـیرەت وا بەدەسـتی ئێمـەوە
سەد دەخیل ئەی قەوم و میللەت با لە دەسـت نەکرێتـەوە
خـاکی ئێمـە ئـەی ڕەفیقـان دارو بـەردی گەوهـەرە
جێـی ژیانـە وەك بەهەشـتە جـەهلی تیـا دەخولێتـەوە
هـەر دوعاگۆتانـە(عاصـی) بـۆ وەتـەن بـووە جانفیـدا
شـیعری خۆشـتان بـۆ دەنێـرێ ئـەو دڵـی دەکرێتـەوە .

* * *

## (٢١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

نامەکەی وەختی فیراقت هات بە ئەشکی خوینەوە
ئاگری عیشقت لە دڵما وا بەتەك بەنزینەوە
چاوەڕێی وەسڵی ئەتۆیە تەن بە جارێ دامرێ
کاتی وەسڵم من مەراقە چیم بە ماددەی ژینەوە
وا لەچینی زوڵفی تۆدا پێ لە کۆتی عیشقی تۆم
چینی ئەگریجەی ئەتۆم بێ چم بە سەر ماچینەوە
بەینی ئەبرۆت سەجدەگاهی عاشقی دڵ خەستەیە
غونچەیی لێوت دەمی دا وا بەسەر پەرژینەوە
من کە چاوم هەر لە تۆیە تۆش بە عیشوە رووکە من
تا نیساری مەقدەمت کەم رۆم بە قوستەنتینەوە
سوخمە ئاڵی قەد سنۆبەر لێم بپرسە دەفعەیێ
پێم بڵێ حاڵت چلۆنە تۆ بەدەم ناڵینەوە
چاو رەشی ئەبرۆ کەمانی بۆ بە کوشتن حەز دەکەی
شاهیدم موژگانی خۆتن بەو برۆی قەوسینەوە

شــاهیدێکه ڕۆژی مەحــشەر بـۆ شـەهیدیم وەك بـە چـین
من بـەرەنگی زەردی خـۆم و تـۆش بـە پەنجـەی خوینـەوە
عالـەمت کـردووە بـە عەبـدولافی سـالاریت هەیـە
بـەوکلاوەی لاری خـۆت و چـاوی خومارینـەوە
بـۆ شـەرارەی نـاری عیـشقت شـاهیدت بـۆ بێنمـە روو
وەك هەناسـەم گەییـە زولّفـت پەرچـەمت لەرزینـەوە
سـەیری نەشـئەی دڵبـەرم کـەن وا بەلەنجـە کەوتـەرێ
بـەو کـەوای گوڵـداری زەردو قۆنـدرەی لاپـچینەوە
مـن بەدەسـتی عیـشقی تـۆوە رووگـوڵی گـەردەن بلـوور
بولبـولێکم زۆر پەرێـشان وام بـە چـنگ شـاهینەوە
بـۆ تـەوافی کەعبـەیی رووت هـاتووم مـەنعم مەکـە
جێـژنی قوربانـە سـبەینێ بمکـوژە مەمژینـەوە
تیری عیشقت دا لـە جـەرگم مـەوجی خـوێنم گەییـە دڵ
خوێن لە هـەردوو لا بـە دائـیم تـك بـە تـك ئەتکێنـەوە
کوشـتەیی تیغـی برۆتـە بـێ کفـن بیـشارنەوە
تابڵێن (عاصـی ) شـەهیدە خـوێنی گـەش بـە برینـەوە

❊ ❊ ❊

(٢٢)

( به موناسەبەتی نەورۆز داوایان کرد شتێك بنووسم . منیش بەناوی بەخێرهاتنی قائیمقام وئامیر فەوج چەند شیعرێکم به عەرەبی و کوردی نووسی له ١٣٩٢ ی هجری و له ١٩٧٢ ی م)

## ئەمەش هەڵبەستی کوردیمه

چـەند زەمانـە کـورد دەنـاڵێ بـەم شـرینقەو بەنجـەوە
چوو لە دەستیان نیشتمانیان گشت بـە غەزنـەو گەنجـەوە
کەوتنە بەردەستی ئەوانـەی خـوێنی جـەرگیان فڕدەکـەن
رەنجـەڕۆ بـوون تـاکو دەمـرن بـەو نەخۆشـی و رەنجـەوە
شـێری عیززەتمـان ئەسـیرە وا لەچـنگ رێـوی نیفـاق
گـورگی بێگانـە دەمـاغوا وا بـە پـیرو گەنجـەوە
ئافەرین بۆ کـوردی پێشوو بوونـە یەکـدڵ بـۆ هوجـووم
سـەیری کـاوە چـۆن زوحـاکی خـستە گێـژو مەوجـەوە
تەفرەقـە بۆتـە رەوشـتمان فیکـری سـەرکەوتن بەچـی
ببنەیـەك سـەف بـا نەفـەوتێن بـەو دەمـاغی گەوجـەوە

هــەروەکوو دیــواری پــۆلا ببنەیــەك پارچــە هــەموو
چــیت لــە نــاکۆکی و مــەراق و پرتــە پــرت و منجــەوە
رۆژی نــەورۆزە عــەزیزان ئــەووەلی فەســڵی بــەهار
کــاتی شــایی و هەڵپەڕینــە زۆر بــە لارو لەنجــەوە
فەرمو با هەستین بچین و سەیری ناو باغان بکەین
شــۆڕەبی بــسکی دەلــەرزێ روو بــەرووی ئەگریجــەوە
غونــچە دێتــە پێکــەنین و بولبــولیش ئێــشك چــییە
بــەڵکو ئیمــڕۆ خــۆی ببینــێ لێــو بــە لێــوی غونــچەوە
بۆنی بــەیبوون و هەڵاڵــە و ســووره گــوڵ تێکــەڵ ئــەبێ
نێرگــس و لالــە و بنەوشــە بــەو گڵــووکی قنجــەوە
یەککــەتی بــوو کــەولی کــاوەی کــردە بەیــداغی نــەجات
خــوێنی ناپــاکی زوحــاکی کــردە کۆنــە کونجــەوە
تــۆش لــەباتی بــەزم و شــایی چــاکە عیــبرەت وەرگــری
داری فیتنــــە هەڵقــەنێنن زوو بــە ریــشەو پنجــەوە
ســاڵ بــە ســاڵ وا دێتــە بەرچــاو هێرشــی کــاوەی دلێــر
گۆشــتی گورجیلــەی زوحــاکی وا بــە نــووکی پەنجــەوە
پــێم بلــێن کــوردی عــیراق کامــەی لــە کــاوەی کــەمترە
ئــاخ خــەریکی داش بــە داشــن وا بــە فــەردو زەوجــەوە

شێری مەستی ئێمە ئیمڕۆ کاکی کورد ، بەرزانییە
خۆش تەبیعەت نەرم وناسك بەولەتیفی ولەهجەوە
وەك پڵنگی چنگ بە خوێنە شێری نەڕ دێنێتە داو
ئەو سەرۆك وپشتیوانە بەو قەڵاَت و بورجەوە
چەپلە لێدەن هەردولاتان دەنگی (فلیحیا العرب)
با بچێتە مێشکی عالەم تا بە چین و زەنجەوە
روولە خوا کەن قەومی کوردی دینە ئێوەی بردە پێش
رووکەنە ڕێگای هیدایەت زوو بە پیروگەنجەوە
سەد ئەسەف مووخی دەماغمان بۆگەنی کرد تەفرەقە
(عاصی) تا ماوە دەگریێ بەو شرینقە و بەنجەوە

لە کۆیە نووسراوە

❊ ❊ ❊

## (٢٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلى هەشتى مەحزووف)

ئەی مریدان سەد بەشارەت شاهی شاهان هەر ئەوە
شاعەلائەددین بناسن قوتبی دەوران هەر ئەوە
هەر کەسێ غەوواسە ئێمڕۆ بێتە دەریای کۆیی ئەو
گەوهەری مەقسەد دەبینێ بەحری عیرفان هەر ئەوە
جێی نەجاتە ئەی موسلمان کۆسپەکەی دەرگاهی ئەو
بۆ پەناهی بێ نەوایان غەوس و سولتان هەر ئەوە
پێی بڵێن هەر چی ئەسیرە کەوتە زیندانی خەتا
دوژمنی نەفسی خەسیس و کەیدی شەیتان هەر ئەوە
مورشیدی هەر پێنج تەریقەت شەهسواری ئەولیا
مەزهەری ئەلتافی حەقق و نووری ئیمان هەر ئەوە
ساحبی (ضمنية الكبرى)یە ئیمڕۆ تێ بگەن
چونکە (غوث المستمدين) بۆ مریدان هەر ئەوە
هەر کەسێکی دەردەدارە زاهیرو باتین حەکیم
بێتە دەرگەی بۆ نەجات بوون ئیمڕۆ لوقمان هەرئەوە

بۆ نەتیجـەی مەزرەعـەی دڵ تـۆوی تەوحیـد بێتـە دەسـت
بەرقی نـووری خـۆری رەحمـەت ئـەبری نیـسان هـەر ئـەوە
تـۆ دەزانـی جێـی نەجاتـە ئاسـتانەی شـا عـەلا ء
کەعبـەیی موقـسوودە بـۆ دڵ کـانی ئیحـسان هـەر ئـەوە
فـەخری دینـی مـستەفایە جیلـوە بەخـشی ئـەهلی دڵ
جێنـشینی نەقـشبەندو غەوسـی گـەیلان هـەر ئـەوە
زیلجەناحەینـە بـەوەللا مەرجـەعی فتـوا بـە حـەق
واریـسی فـەیزو زیـاوو شـاهی عوسمـان هـەر ئـەوە
مەزهـەری لـوتفی خـوداوو خۆشەویـستی حەزرەتـە
پـەیڕەوی فەخرولئـەنام و ئـەمری سـوبحان هـەر ئـەوە
هـەر ئـەوە غەوواسـی بـەحری عیلمـی بـاتین بـێ خـیلاف
مورشیدو مـوفتی وو غـەوسـی جینـن و ئینـسان هەرئـەوە
ئـەی دڵـی پەروانـە گـەرتۆ تـالیبی نـووری وەرە
روویـی ئـەو زاتـە ببینـە شـەمعی رەخـشان هـەر ئـەوە
(عاصی) رووت کردووە لە دەرگەی حەزرەتی غەوسوززەمان
جێـی نەجاتـە دابنیـشە چـاری عیـسیان هەرئـەوە

* * *

(٢٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

فورسەتە ئەی کورد دەخیلە قەت نەکەن بکشێنەوە
ئینتیقامی دین وناموس زوو بە زوو بستێننەوە
بەو خودایەی لامەکانە بێ خودا هیچ ناکرێ
ببنە حیزبوللا عەزیزم قەت لە یەك مەپسێنەوە
پشتیوانتان گەر خودابێ کێ هەیە خۆی راگرێ
خوا لە قورعان وەعدی داوە ئایەتە بخوێننەوە
ئیشتراکی و مارکسی بۆ دینی ئیسلام ئاگرن
بۆ خودا تێکۆشە ئەی کورد هەردو لابکوژێنەوە
ئەو کەسەی فتوای کە داوە پیاوو ژن تێکەڵ ببن
دیارە بێ ناموسە بۆخۆی زوچنە بیشکێننەوە
ژاری وەی بابی نیفاقە جەرگی کوردی وارزاند
زوو بە بەردی یەککەتیتان مێشکی ئەو پرژێننەوە
سەیری تاریخ و کتێب کەن هەر نیفاقە کوردی کوشت
(عاصی) جەرگی پڕ برینە چی تری مەکولێننەوە

* * *

## (٢٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

چــەند زەمانــە مــن نەخۆشــم وا بــەداخی کــوردەوە
بەختی سووتا بوو لـە شـەترەنج یـەك کـەڕەت نـەیبردەوە
ژووری غەمخانــەی ئۆمێــدم ئــەم هیوایــەی قــەت نــەبوو
تــا چــرای ســوبحی ســەعادەت هــات و ڕوونــی کــردەوە
حەیــدەری کــەڕڕاڕی کــوردان هاتــە جۆشــش غیرەتــی
عــەزمی پــاکی هاتــە نــاودڵ دەرکــی دەعــوای کــردەوە
تــۆپ ودەببابــەو تــەیارە کەوتنــە گرمــەو ناڵــە نــاڵ
ئەو پڵنگی چنگ بە خــوێن بــوو هــات و دەســتی کــردەوە
وەك عەســای مووســابوو بڕنــەو ســاحیری کردنــە ئەســیر
بۆیــە فیرعــەونی زەمانــە کەوتــە بــەحری زەردەوە
تــۆپی فتبــۆڵ هاتــە مەیــدان تیپــی مــەغروور تێــشکا
شــوکرولیللا مامــەپیرە شــەش بــەهیچ لێــی بــردەوە
ئــەو هــەموو کــوردە هــەژارەی تــاکو ئێــستا مردبــوو
هــەروەکوو عیــسایی مریــەم گــشتی زینــدوو کــردەوە

هیممـــەتی بـــەرزی ســـەرۆك و کوشـــتنی پێـــشمەرگەکان
گەردنیان کەچ کـرد بەبەعـــسی بـەو دڵــەی وەك بـەردەوە
گەر مەراقتە کـاکی گـوێگر فیکـریێ لـەم رەمــزەی بکــە
تــێ دەگــەی ئـەم نـاوە بـەرزە کــێ بـوو پەیـدای کـردەوە
زوو بـــچۆ بـــن کێـــوی غـــیرەت ســـەیری بـــەرزایی بکـــە
نوختەیێکـــە بـــۆ ئیـــشارەت کـــێ بـــو نـــەردی بـــردەوە
ببنەیـەك پارچـە دەخیلـە روو لـە خـوا کـەن زوو بـەدڵ
کــانی زێـــڕو چـــەند مـــەعادین وا بـــە دەســـتی کـوردەوە
خزمەتی دین و وەتەن کـەن تـا لـە دەسـتتان دەرنەچـوون
پشتیوانتانن گەر خـودا بـێ چیت بـە کێـو و هـەردەوە
(عـاصی) هێشتا هەر نەخۆشە چونکە کورد دووپارچـەیە
ترســـی تێـــك چـــوونە دەگریـــا وا بـــەدەنگی زەردەوە

* * *

(٢٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

لەبیارەی بووم ، شێخ چووە ئەحمەدئاوا
بەگزادەیەکی هەورامی داوای بەشی دەکرد لە ئەحمەدئاوا
شێخ زۆرمایەوە
منیش زۆر ئارەزووی شێخم هەبوو. ئەوەم نووسی:

چـــاوەڕێی ڕێگـــای تـــەبیبم بـــەڵکو ئیمـــڕۆ بێتـــەوە
تـــا برینـــی دەردی هیجـــری زوو بـــە زوو چـــابێتەوە
جۆشـــشێکی خـــستە نـــاو دڵ ئـــاگری هیجرانـــی یـــار
خـــۆ بـــە ئـــاوی زەڵـــم و ســـیروان زەحمەتـــە بکوژێتـــەوە
عـــەرزو حاڵێـــك بابنووســـین بـــۆ زیائـــەددین عومـــەر
بـــەڵکو فرمێـــسکی لـــە چـــاوی غیرەتـــی بەربێتـــەوە
ئـــەو کەســـانەی بوونـــە بـــاعیس ئـــەم فـــیراق و زارییـــە
بـــا چـــرای عـــومری عـــەزیزی تـــا ئەبـــەد بکوژێتـــەوە
بەشقی مـوویی [1] ڕوویی زاتی فەخری عالەم ئـەی خـودا
چـــاوی کـــوێر بـــێ دەســـتە ئـــەژنۆ نوتفەشـــی ببڕێتـــەوە

[1] چونکە (١٠) مووی مەحاسینی شەریفی حەزرەتی ڕەسولەللا (ص) ئەوا ئەلئان لە بیارەیە ، لە مەرقەدە، لە پشت سەری حەزرەتی زیائەددین . (عاصی )

هەرکەسێ لەم خانەدانە فیکری زوڵمی گەربێ
غەرقی تۆفانی غەزەب بێ تا ئەبەد بخولێتەوە
گەر چە من (عاصی) م وئەمما خاکی پایی دڵبەرم
داغی ئەم دەردە لە دڵدا زەحمەتە رەش بێتەوە

*　*　*

(٢٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

## بە موناسەبەتی ڕۆژی مەولوودی فەخری عالەم
## (صلی الله علیه وسلم )
## لە ساڵی ١٣٩٣ هـ و ١٩٧٣ م

موژدە بێ بۆ قەومی ئیسلام بەحری تەوحید ژیایەوە
دەرکی ئاگر داخراوو جەننەتیش ڕازایەوە
ڕۆژی ڕێژنەی لوتفی خوایە ئومەتی خەیرولئەنام
بەحری ڕەحمەت کەوتە جونبوش واشەپۆلی دایەوە
سەیری بەیداغی بەشارەت بۆ مەقامی خاتەمی
شادمانی ئەیلەرێنێ نووری لێ ئەتکایەوە
ئەرزو ئاسمان پڕ لە نوورە ڕۆژی کەیف و شادییە
غونچەکەی باغی نوبووەت سەد شوکر پشکوایەوە
کاتی تەبریکە موسڵمان حەزرەتی ڕووحولئەمین
هاتە بانی کەعبەتوللا وا بەچەند ئاڵایەوە
بۆتە خاتەم بۆ نوبووەت ئەحمەدی خەیرولبەشەر
نووری تەوحیدی بە قووەی مەعریفەت هێنایەوە

مرحبـــا اهـــلا وســـهلا يـــا امـــام الانبيـــا ء
خاتـــەمی لايـــەق بـــە تۆيـــە بـــەم بلّنـــدی و پايـــەوە
كـــاتی پەخـــشانی خەلاّتـــە بـــۆ موســـلّمانی موتيـــع
دەركی رەحمەت كەوتە سەرپـشت نـووری ديـن ئايسايەوە
هاتە دونيـا فـەخری عالـەم سـەيری بـۆ تـەبرێكی ئـەو
چـەند هـەزار ئـالاّو مەلايـەك وا بـەرووی دنيايـەوە
سـەيری سـام و هەيبـەتی كـەن رۆژی مـيلادی ئـەوی
تاقی كيـسرا كەوتـە رووخـان گـشت بـە تـاق و پايـەوە
بـۆ بلّنـدی حورمـەتی ئـەو هـەم بـەناوی مـوعجيزە
دووكـەڵی فـارس خـلاس بـوو ئاگرەكـەی دەكوژايـەوە
ئـاوی سـاوا بـوو بـە دێـم و ئـەو بوحـەيرە وشـكە بـوو
ئـاوەدانی لێ خـەلاس بـوو وا لـە هەرچـوارلايەوە
سوورەتی (اقرأ ) لە قورئان وەك كە جبريـل تێـی گەيانـد
سـەحفەيی تـەورات و ئينجيـل يـەك بەيـەك پێـچايەوە
حوكمی قورئان بوو بە دەستوور بۆ ئەجيننەو هەم بەشـەر
حەمـدوليللا فيكـری تەوحيـد سـەرلەنوێ واژيايـەوە
داری بانگ كردو كە هاتيش مەيلی سـەجدەی بـۆ دەكـرد
كـۆترە باريكـە لـە ئەشـكەوت دوژمنـی گێڕايـەوە

یــەك منــاڵ بــێ داك و بــێ بــاب قــووەتی پێغەمبــەری
خــوای قورەیــشیانی لــە کەعبــە ســەرنگوون بەردایــەوە
یەعنی جورمی لات وعــزا هــەم مــەناتی تێــك شــكاند
بــوو بــە ئیــسلام پیــاوی عاقــڵ زوو لــە كفــرا كــشایەوە
خوا لە سوورەی نوون لە قورئان مــەدحی ئــەخلاقی دەكــا
سەیری بــەحری عیلمــی ئەوكــەن حیلمــی لێ دەخولایــەوە
دوژمنی گــەورەی ئــەوی بــوو وا ئــەبوو جــەهلی لــەعین
شــیری تیــژی عیززەتــی دیــن زوو ســەری پــێ نایــەوە
یــا رەســوولەللا بــە قوربــان چاوەشــی تــۆم كــوا خــەڵات
خــۆت دەزانــی بــۆ شــەفاعەت چــەند بــە دڵ پاڕایــەوە
شوهرەتی خۆم كــردە (عاصــی) ســەد هــەزارجار تۆبــەبێ
دڵ پەشــیمانە بــە راســتی بــۆ حــەیا بایدایــەوە
زۆر خــەریك بــوو تــاكوو پیربــوو وا لەگــەڵ دنیــایی دوون
فائیــدێكی وەرنــەگرت و چــەند بــە چــەند چەوســایەوە
پــیر و بــێ هێــزو زەبوونــە مــستەفای (عاصــی) دەڵــێ
ئــەی تكاكــاری گوناهكــار رووبكــە بــەم لایــەوە

* * *

(٢٨)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

**بە موناسەبەتی مەولوود کە لە مزگەوتی گەورەی کۆیە بەسەرپەرشتی مەلایەکان کرا ، منیش ئەوەم نووسی و خوێندمەوە موقابیل بە خەتمی پێغەمبەر. ئەگەر ئەو غەزەلە کەم بوو ئەمما گەلێکم زیاد کرد، بە موناسەبەتی مەولوود**

گوڵشەنی خەتمی نوبووەت هەر گوڵێکی گرتووە
سەیری بۆن و جەوهەری کەن کائیناتی گرتووە
گەوهەرێکی شەوچراغە ئەووەل و سانی نییە
شەوقی دینی شەرق و غەرب و ئاسمانی گرتووە
دانە دوورڕێکە بە شکڵی ئادەمی هاتە وجوود
نووری تەوحیدە لە جیلوەی مەعریفەت پەیدا بووە
چوونی سەرئەوجی نوبووەت بۆ مەقامی خاتەمی
ئینتیخابی لوتفی حەققە ئیختیاری کردووە
سەیری کەن پەرگاری قودرەت حوکمی نەققاشی ئەزەل
سوورەتێکی چۆنی کێشاوە سەوقی کوێشی کردووە

کردییــــە خەیرولخــــەلایق بردییــــە عەرشــــی عــــەزیم
جبرەئیلــی کــردە دختــۆر شــەرحی ســینەی کــردووە
چەند لــە پــێش خــەلق و وجــودی ئــادەمی بــابی بەشــەر
بۆ نەجات کردییــە شــەفیع و تــا لــە نەکبــەت دەرچــووە
وا مــــەزانن شــەوقی رۆژە جلــوە بەخــشە بــۆ زەمــین
زەڕڕە نوورێکــە لــە رووی ئــەو ئیقتیباســی کــردووە
هــەم مــەزانن کۆچــی دوایــی ئــەو لــە دنیــا مردنــە
وا لــە ســایەی عەرشــی ئــەعلا تــا قیامــەت نووســتووە
یـــا رەســـوولەللا تەماشـــا ئومـــەتت میـــوانی تـــۆن
جێـــژنی مـــیلادی ئەتۆیـــە گوێزەبانـــەی کـــردووە
کۆمــەڵی ئیــسلامە هــاتوون پێکــەوە کــورد و عــەرەب
قـــووەتی دینـــی ئەتۆیـــە پـــشتی یـــەکیان گرتـــووە
تــا لــەدەعوای خاتەمیــدا تــێ بگــەن بــا خــاس وعــام
خــوا لەقورئانــدا بــە خاتــەم شــوهرەتی دەرخــستوە
جێژنــەتان پــیرۆز هــەمووتان ئومــەتی خەیرولئــەنام
خــوا قبــووڵی کــا بەرەحمــەت رێــی ســەوابتان گرتــووە
سەد دەخیل ئەی شاهی لەولاك تۆش بفــەرموو مەرحــەبا
چونکە رێز گرتن لــە میــوان خــۆت پەســندت فــەرمووە

چـۆن ڕەوایـە مـن لـە قاپیـت دەرکـرێم بـێ بـەهرە بم
چونکە عـومرم مـن لـە هەشـتا زیـاتریش تێپـەڕ بـووە
بـەو شـەقامی دینـی تـۆدا تـاکو ئێـستا هاتمـەرێ
خـوا دەزانـێ لام نـەداوە بـەڵکو قـاپیم تـەڕ بـووە
ئەوکەسەی مەدحت کە کـردووە ئـەو شـەفیعە مـستەفا
مـستەفای موختـار لـە دەرگـەت مـستەفایەك کـەوتووە
پـڕ گونـاه و ڕوورەشـێکە ڕووی نییـە بێتـە حـزوور
قـەد خەمیـدەو تـەن زەبوونـە پـیرو بـێ تاقـەت بـووە
دەسـتی مـن دامێنـی عـەفوت چـاوەنۆڕی مەرحـەبام
نەك بڵـێن بـێ بـەش لـە لوتفـت دەرکـراو خـوێڕی بـووە
چـەپڵە لێـدەن ئـەی موسـڵمان ڕۆژی ڕێژنـەی ڕەحمەتـە
نـووری فەخرولعالەمینـە تەلعـەتی وا کـردووە
بـاری شـانی زۆرگرانـە چـونکە نـاوی (عاصـی)یـە
وا لـە قاپیـت ڕووم لـە ڕیـزەی خـوانی لوتفـت کـردووە

❊ ❊ ❊

(٢٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## مەرسییەی مەلا بەهائەددینی برازام
## لە (١٥) ی ربیعولئەووەلی سەنەی ١٣٧٤ ،
## رێکەوتی ١٩٥٤/١٢/١١ وەفاتی کرد لە دێی (کارێزە ) ی ناوشوان .
## وا لە خاڵخاڵان ناشتراوە . خودایە عەفووی بکەی

قـــووەیی نـــوقم نـــەماوە فیکـــرو هۆشـــم کـــەم بـــووە
ئـــاگری مـــەرگی عـــەزیزە وا لـــە جـــەرگم بـــەربووە
گـــەر دەپرســـن بۆچـــی ئێـــستا ســـینەکەم وێرانەیـــە
قونبولـــەی فرمێـــسکی چـــاوم بۆردومـــانی کـــردووە
نـــووری چـــاوم قـــووتی رووحـــم هێـــزی ئەنـــدام و دڵـــم
نەوجـــەوانی جوانـــە مـــەرگم کۆچـــی دوایـــی کـــردووە
ئاخـــەئاخی وەختـــی نـــەزعی حەســـرەتا مـــامم نـــەهات
بۆتـــە خـــۆرە وا لـــە جـــەرگم زۆر بـــە ناســـۆر کـــەوتووە
یـــادی دەرناچـــێ لـــە قـــەلبم مـــەنزەرەی روخـــسارەکەی
دڵ وەکـــوو ئاوێنـــە عەکـــسی قـــەددوباڵای گرتـــووە

بـــای ئەجـــەل هـــات و لـــەناکاو مەدرەســـەی پێـــچایەوە
حوجرەکـــەی تەدریـــسی ئێـــستا تـــۆزی غـــەم لێـــی نیـــشتووە
یەك هەزارو سێ صەد و حەفتاو چوار بوو کۆچی کرد (١٣٧٤)
چـــۆتە خاڵخـــاڵانی پـــیرۆز تـــا قیامـــەت خـــەوتووە

* * *

(٣٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

یا ڕەسوولەڵلا لە دڵما ئیشتیاق پەیدا بووە
مەزرەعەی سەبرم بە جارێ ئاگری تێ بەربووە
وا مەحەببەت ئیستیلای کرد پێم تەسەڵلا نادرێ
باغی ئومێدی ویسالم تازە غونچەی گرتووە
سەد ئەسەف وا حەسرەتا ڕەوزەی مەدینەم هەرنەدی
چارو بێچار هەر دەناڵم دڵ لە دەستم دەرچووە
سینە گەر بێت و بسووتێ قەت عەجایب تێ مەگەن
وا چراغی ئیشتیاقم بۆ ویسالت پێ بووە
کەی دەبێتن بچمە ڕەوزە تا بڵێم ئۆخەی ئەوا
مستەفای (عاصی ) لە قاپی مستەفادا کەوتووە

* * *

## (٣١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

یــا ڕەســوولەللا دەخیلــە مــن دڵــم غەمخانەیــە
ئــاگری فیتنــە هەڵایــسا عالــەمیش پەروانەیــە
بای غەزەب هەنـدە بـەهێزە عالـەمیش پـووش و پـەڵاش
حەســرەتا چــاك و خــەراپی ئــەو لــەلا یەکـسانەیە
قــەترە فرمێــسکی هــەتیو و ئــەهلی مــەزلووم و فــەقیر
دوور نییــە ئاسمــان کــە ڕەش کـا پێــی بڵــێن خمخانەیـە
بــێ شــعوور و بــێ دەماغــە هەرچــی دەیبینــی دەڵێــی
گــشتی سەرخۆشــە بــە جارێ مەســتی نــاو مەیخانەیــە
گــەر نییــە ئیمــدادی عالــەم ئــەی ئومێــدی ئومــەتت
عالــەمی ئیــسلام نەخۆشــە فیتنــە وەك جۆلانــە یــە
گەرچــی ئێمــە موســتەحەققین یــا حەبیبــەللا دەخیــل
چەند زەعیفــەی پیــاو کــوژاوو بــێ کــەس و وێرانــە مــاڵ
چــەند منــاڵی وا بــەدواوە بــێ پــەناو هێلانەیــە
وا فەلــەك کەوتۆتــە ناڵــە هــەم مەلــەك زۆر عــاجزن
گــوێی لــە ناڵــە و نــووزە نــووزی دەنگــی ئــەو گریانەیــە

تـــۆپ و دەببابـــە لـــە ئـــەرزو قونبولـــەی تـــەییارەکان
روو لـــە هـــەر جێگـــا دەکـــاتن ســـاعەتەن وێرانەیـــە
کەس بە کەس رەحمی نـەماوە چـی لەگـەڵ یـەکتر بکـەن
لای حەلالـــە قـــەتل و ســـووتان ســـەیری لـــەم پەیمانەیـــە
یـــا رەســـوولەللا دەخیلـــە تـــۆ عـــیلاج و چـــارەکە
بـا لـە دەسـتمان دەر نەچـێ دیـن بـەو هـەواو پیلانەیـە
حوکمی قورئان و حـەدیس و شـەرعی ئیـسلامی هـەموو
رەغبـــەت و قـــەدریان نـــەماوە دیـــن و دونیـــا ئانەیـــە
تـــۆی تـــەبیبی دەردی (عاصـــی ) یـــا رەئیـــسەلئەنبیا ء
زوو تـــەداوی کـــە دەخیلـــە ئێـــشەکەی دوڕخانەیـــە [1]

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (گەربکەی دەرمانی دەردی چاری ئەم دەرمانەیە).

## (٣٢)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

سەیری ئەم کۆیە لە ئێرە وەك سەرای شاهانەیە
ساحیبیشی قەول و فیعلی هەردو هەر مەردانەیە
ئەو لە گەڵ دیوانی شادا نسبەتی چۆن باوەڕە
چونکە قوبباد لێرە ئیمڕۆ خادیمی دەرگانەیە
قەسرو تەختِ و باغ و بەختی وەك سلێمان دائیما
مەرجەعی خاس وعەوام و ئەقریبا و بێگانەیە
تەختی ئیقبالی فەریدوون بۆتە فەرشی بەختی ئەو
جامی جەمشید جەوهەرێکە مەعدەنی لێرانەیە
تاجی کەیکاوس مەسینەی قاوەجاغی مەجلیسی
بۆیە بۆ شەمعی جەمالی (عاصی ) وەك پەروانەیە

* * *

(۳۳)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## جەوابی جێژنە پیرۆزەی
## مەلاسەید محەمەد لە هەولێر

لـوتفی عامـە وا بـە قوربـان خاسـسی زولقوربـا نییـە
لێـت موبـارەك جێـژنی قوربـان مەوسـیمی قوربانییـە
زۆر بـە فـەخرو کامـەرانی دەسـتەکانت مـاچ دەکـەم
خـۆم بـچووکی تۆمـە قوربـان مـن سـەرم قوربانییـە
سـەر دەنێمـە ژێـری پێـت و بـەردە بـازی رێگەتـە
فـەخرە بـۆمن هـەردو چـاوم مننـەتی تێـدا نییـە

❊ ❊ ❊

## (٣٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەل هەشتی مەحزووف)

کەس وەکوو تۆ یا ئیلاهی بێ کەس و هەمتا نییە
کەس وەکوو من پڕ خەتاوو خام و بێ تەقوا نییە
موفلیس و مەحزون و بێکەس روو لە قاپی کێ بکەم
خۆ لە قاپی تۆ زیاتر هیچی تر مەئوا نییە
تاکو دەمرم گەر فیرار کەم من بە تەبیارەی هەوا
ناگەمە جێگەو پەنایێ غەیری تۆ مەئوانییە
رۆژو شەو سەرفی خەیاڵم من لە فیعلی خۆمە کەم
هیچ کەسێ وەك تۆ خودایا رەحمەتی بێ پا نییە
خۆت ئیلاهی پێت نیشان دام ناوی رەحمان ورڕەحیم
یارەحیم ئیرحەم بیحالی دیارە چیتر خوا نییە
هەرچی نووسیومە لە دەفتەر وەسفی حاڵی خۆمە من
مەقسەدم ئیزهاری حیلم و شوهرەتی بێ جانییە
نیمەکاریێ موقتەزابێ بۆ رەزاو و رەحمەتت
میسلی من لەم عەسرەیارەب رووسیا و رسوا نییە
(عاصی ) هەرچەندە لە فیسقا غەرقە ، ئیمانی هەیە
غەیری تۆ بۆ کەس خودایی مومکین و بڕوا نییە

* * *

(٣٥)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

شەهنشا بووم لە وەختێکا ئەوێستاکەش گەدام یارەب
لە گەڵ ئەو حاڵەشا سەیری ئەسیری دەست هەوام یارەب
حەتا پەنجاوو سێی هیجری ئەمن چەند حورڕ و سەربەست بووم
کەچی وا بوومە عەبدێك و بەسی درهەم کڕام یارەب
چرای شەوقم لە بەینێ کا بە قووەی کارەبای فیکرم
دەئێستا وو ئەمێستاکەش عەوامێکم نەفام یارەب
دەزانی چۆن لە دەورێکا کە ساحیب ئەمر و نەهیی بووم
بە پەنجەی ئەمرونە هیی غەیر بە دائیم وەك کەلام یارەب
بە گەنجی عیززەتێکم بوو ئەسەف لەم عومری ئاخیرما
موقەددەر سەوقی وا کردم ئەمن بوومە غولام یارەب
هەمیشە مات وگەردەن کەچ کەمەربەستەم لە بۆ خزمەت
بە هەیئەت گەرچی ئینسانم موقەببای بێ بەهام یارەب
لە جنسی دائیرەی ئینسان نییە دڵدارو یارێکم
لە دۆست و خزم و بێگانە ئەمن هەر بێ وەفام یارەب

دەمـــاغم خاڵییـــە دائـیم لـــە هـۆش و عـــەقڵ و ئیـــدراکا
وەکوو پووشـی جەبـەل دائـیم چـە بـێ قـەدرو بـەهام یـارەب
لــە گێـــژی زیللـــەتا غـــەرقم شـــکاوە لەنگـــەری هۆشـــم
لـــەخاکی حەســرەتا ئیمـــڕۆ ئـــەوا بوومـــە نـــەمام یـــارەب
بـــە دەردێکـــی گرفتـــارم سەوابیـــشم خەتایـــە مـــن
ئەگـەر چـی بـێ وەفـاش نیمـە وەلێ هـەربێ وەفـام یـارەب
لە ژێر خەیمـەی نەدامەتـدا لـە نـاوجێی میحنـەتا کـەوتووم
لـــە ئەجزاخانـــەیی رەحمـــەت بـــە ئومێـــدی دەوام یـــارەب
ئـەتۆ عیلمـت هەیـە گـەرمن تەکـەببور پـەروەریم نـەبووە
هـــەتا ئێـــستا بلێـم بۆیـە بـە زیـیـەت موبتـەلام یـارەب
نـــەماون داك و بـــابی خـــۆم هـــەتا دڵیـــان بـــسووتێ بـــۆم
چە کەس رەحمێ بـە مـن ناکـا ئـەتۆی پـشت و پـەنام یـارەب
لـــە مایـــەی دیـــن و ئیمانـــا زەرەردارم نەکـــەی بەسمـــە
حـەیاتم نـاوێ گـەر بژیـەم بـە قـووتێکی حـەرام یـارەب
دڵـم وەك شووشـە پـڕژاوە بـە بـەردی میحنـەتی تەعنـە
زەلەی زیللـەت شـعووری بـرد لـە ژێـر بـاری خـەتام یـارەب
بە حـەققی خوایـەتی خـۆت و بـەرەوزەی مـستەفای موختـار
نـەجاتم دەی لـە ئـەم حاڵـە نەچـی مـاددەی حـەیام یـارەب

بــه فرمێــسك و دلۆپــەی چــاوی شــەوخیزانی وا مــوخلیس
بکــەی دەرمــانی دەردی دڵ کــە چــونکە بــێ نــەوام یــارەب
لــە تەعنــەی یــارو ئــەغیارە ئەمانــەم وا بەدڵــدا هــات
هــەزار دەفعــە خــودا تەوبــە بــە هــەرحاڵێ رەزام یــارەب
کــە چــونکە بوومــە هاونــاوی رەســوولی ئــەووەل وئــاخیر
بــسێنی ئینتیقــامی دڵ کــە (عاصــی) م موســتەفام یــارەب

❊ ❊ ❊

(٣٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

## مەرسییەی شێخ عەلائەدینی بیارە قدس سرە كە لە (١٣٧٣) وەفاتی فەرمووە لە بیارەی شەریف

كۆچی كـرد ئیمـڕۆ لـە دونیـا وا لـە جەنبـەی ڕۆژهـەڵات
شەهـــسواری عەرســـەگاهی دینـــی فـــەخری كائینـــات
نـــائیبی فـــەخری ریـــسالەت مەزهـــەری ئـــەلتافی حـــەق
مورشـیدی ڕێگـەی هیدایـەت مەسـدەری ئـەعلا سـیفات
هەوری نەكبەت هاتە ئاسمان ئـاوی حەسرەت هاتـە خـوار
ســـوورەتی تۆفـــانی كێـــشا وا لەســـەر جوملـــەی وڵات
ئەشكی دیدەی چەرخی گەردوون خاك بە سەرخۆیدا بكـات
روو لەكوێ كەم؟ روو لە كوێ كەم؟ كێ بەیار بگرم بەدڵ ؟
چـــاوەنۆڕی لـــوتفی كـــێ بم تەربییـــەی رووحـــم بـــدات
پادشـــاهی پـــایی تـــەختی نەقـــشبەندی شـــاە عـــەلا ء
ئیستیقالەی كرد لە دونیـا تـەركی كـرد روتبـەی حـەیات
رووی لـــە عوقبـــا كـــرد و رۆیـــی بـــۆ حـــەیاتی جاویـــدان
پادشـاهی زولجـەلالیش قەسـری عولیـای كـرد خـەڵات

٥

* * *

(٣٧)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلان
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

# دیاری جێژنە پیرۆزە

هــەموو عــومرت هــەتا مــاوی دەقیقــە و زەڕڕە وو ســاعات
هەمووت هەر جێژن و خۆشی بێ بە بێ دەردو غەم و ئافــات
گوڵی مـەقسوودی خۆت بۆن کەی لە ناو باغی ژیــانی خــۆت
ئەمانەش هەر موبارەك بن لــە ڕووح و جیــسم و هــەم بــاڵات
لــە بــۆ ئــەم عــەرزی تەبریکــەت وەکیلــی بەندەیــە کــاتم
بە ئومێــدی قبــووڵ کــردن بــە شــەوقی موخلیــسی واهــات
فەرامۆشــیان نەکــەی قوربــان ئەوانــە موخلیــسی خــۆتن
لــە یــادت دەرنەچــن گــەورەم غــولام و بەنــدەیی دەرگــات

❊ ❊ ❊

(٣٨)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

# چێژنه پیرۆزه
# بۆ قایمقامی کۆیسنجق
# حیکمەت زەهاوی

ساڵ و مانگ و ڕۆژو جومعه هەم شەوو لەحزەو سەعات
نیو دەقیقه نیو هەناسه تا بە نیو زەڕڕەش دەگات
گشتی بۆ تۆ جێژنەبێت و لێت موبارەك ئەی جەناب
کە هرەبای عیززو شەرەفتان دائیما شوعلەی بدات
بەخت و ئیقباڵ هەردو ببنه کارتی (ایا مك سعید )
عەشرەتی عوشرەت لە دڵتا تەپڵی شاهی لێ بدات [(١)]
کامەرانی و کەیف و سیححەت ببنە نێچیری هیوات [(٢)]
شادمانی ئیقتیباسی شادمانیت لێ بکات
گومگومەی سەرتاوەجاخی دیوەخانت تاجی کەی
جامی جەم فنجانی دەستت قەیسەریش قاوەی بدات
ڕۆژی جێژنە بەزم و خۆشی و شادمانی عالەمە
جێژنی (عاصی ) لوتفی تۆیە ئەی بەگی عالی سیفات

❊ ❊ ❊

---

[١] لە دەستنووسێکی دیکەدا ، نووسراوە: (دەوڵەتی عیززەت لە دڵتا ........) .
[٢] لە دەستنووسێکی دیکەدا ، لەباتی (هیوات ) نووسراوە (دڵت ).

## (٣٩)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفوفی‌مەقسوور)

مـــانگی رەمـــەزان رۆیـــوە جێـــژنی رەمـــەزان هـــات
هـەر کـوردی جـەفا دیـدە کـەوا تووشـی خەتـەر هـات
قەومێکـە جگـەر پـارە بـە سـەر پەنجـەیی ئـەغیار
ئیمڕۆکـــــە پەراگەندەیـــــە کەوتۆتـــــە وەڵات
تـــەییارە خەتیبـــە ، لـــە هـــەوا تۆپـــە موئـــەززین
هـــەر دۆشـــکەیە دەسـڕێژی ئـــەکا گوللـــە بـــە چـــوکلات
ئەلغامـــە لـــە جێـــی تـــۆپی بـــە شـــارەت کـــە ئەتـــەقێ
دەببابـــە ئـــەلوورێنی دەڵـــێ کـــوردە ئەجـــەل هـــات
تیزابـــە لـــە جێـــی شـــەربەت و شـــەکراوە پڵاومـــان
هەرســـاتە لـــە نـــاو ئێمـــە کـــە پەخـــشانی ئـــەکات
دەســت رێــژە لــە هــەر لاوە بــە هــەر نەوعــە چــەکێکی
سەدجاشـــە کـــە نامـــەردە هجـــوومی کـــە دەکـــات
فورســـەتە تـــۆش هەســـتە لەخـــەو وەکـــو شـــێر
ترســت نــەبێ لــەو جاشــە کــەرەی ئــەهلی یــی وڵات

سەیری بکە چۆن دوژمنی تۆ هەڵدەپەڕێ
دوو جێژنەیە ئیمڕۆکە لەلای ئەهلی خەرافات
ئەلئان پڕە ئەو دەشتە لە چەند لاشەیی جاشی
گورگ و چەقەڵ و ڕێوییە ئەو لاشەیە ئەخوات
(١)
..........................................................................
نێزیکە کە (عاصی) لە خەفەت ئێوە بفەوتێ
بوونەتە چەند فرقەیی بێ هۆش و جونات .(٢)

❊ ❊ ❊

---

١- ئەم لەتە لە ئەسڵدا نەنووسراوە.
٢- ئەم هۆنراوەیە زۆر لەتی لەنگە.

(٤٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

ئاغـــە توخـــودا لات ڕەوایـــە دەربـــەدەر بم بـــۆ وڵات
ئەشکی خوێنم بێ لـە چـاوی دوور لـە بایزاغـاو قـەڵات
یـــاخو مـــەنفی بم لـــە کۆیـــە هەجەلیـــسم بێتـــە غـــەم
عیـــززەت و شـــادیم نـــەمێنێ مـــن لەگـــەڵ زاری وەفـــات
یانـــە مـــەحرووم بم بـــە جـــارێ مـــن لـــە ئـــەربابی وەفـــا
هەروەکوو دەروێـــش خـــەریك بم کوچـــە کوچـــە بـــۆ دێهـــات
وێـــڵ و ســـەرگەردان و عـــاجیز دوور و ئـــاوارە لـــە یـــار
بـــچمە کێـــوو هـــەردو چـــۆلی میـــسلی زەبتیـــە بومـــەکات
گەر ئەتۆ پێـت خۆشـە قوربـان زیللـەتی غوربـەت بخـۆم
من قبووڵمـە ئـەمری عالیـت ئەیکەمـە تـاجی خـەڵات
عـــەرزو حاڵیـــان داجـــەنابت دائیرەی مەکتـەب لـە مـن
ئیتتیفاقیان کـرد و بیـستم هاتنـە خزمـەت بـۆ شـکات
مـــن مریـــدی شـــای بیـــارەم عـــەرزو حـــاڵم دا بـــە ئـــەو
هـــەر دولامـــان بـــێ قـــسوور بـــین ئایـــا هـــات و یانـــەهات
غـــەیری ســـوڵتانی بیـــارە قـــەت پـــەنای دیکـــەم نییـــە
ئەوتەبیبـــە بـــۆ عـــیلاجم تـــا بـــرینم کـــا قـــەپات
من کە (عـاصـی) م پاسـەوانی جێنـشینی شـا عومـەر
قەت قبووڵ ناکا ڕەزیل بم ، ئاغە مـەعلووم بـێ لـە لات

* * *

(٤١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلى هەشتى مەقسوور)

## ١٩٧٢ لە يەكى ئايارى كرێكار
## ئەبوو بەكر حاجى عەبدوللا حەللاق
## داواى كرد كە شتێكى بۆ بنووسم
## خۆى بەناوى كرێكاران بيخوێنێتەوە
## ئەوەم نووسى :

ئێمـــە تيپـــى ئيـــشگوزارين هـــەم كرێكـــارى وڵات
هـــەر لـــە ڕۆژئـــاواوە يەكـــسەر تـــا دەگاتـــە خۆرهـــەڵات
هەرچى پيێك هاتووە لە سايەى دەســت و بــازووى ئێمەيــە
سازى كــردووە وا بەچــاكى ئەســليحە و قــۆنگرەو قــەڵات
ئێمـــە پاڵپـــشتى ژيـــانين بـــۆ هـــەموو پێويـــستەكان
كــردەوەى دەســـتى كرێكـــار بۆتـــە هـــۆى خۆشـــى وڵات
چونكە مـاندووين ئێمه فەخرين بۆ جنـووب و بـۆ شـيمال
وا عيراقمان كـردە گـوڵزار بـێ غـەم و بـێ هاتـە هـات

بۆچــی وا بــێ بــەش بمێــنین ئێمــە مەنــسەبمان نــەبێ
بــۆ نەچــینە ریـزی عالــەم بـۆ نــەمانبوو قــەت نــەجات
وا لــە مەیـدانی خــەباتا شــان بــە شــانتان دێینــە پــێش
روو بەرووی ناحەز دەوەســتین بــۆ هــەموو وەختــی خــەبات
بــۆ لــە ســفرەی خــوانی مــیری ئێمــە بەشــدارمان نــەبێ
حەیفــە بۆکــۆنگرەی کرێکــار بــێ رەواج و بــێ ســەبات
وا لــە باخــچەی ئیــستراحەت عالــەمێك مەســتی گوڵــە
بۆچ بە فیکری دڵنەوازی کــەس بــە غــەمخوارمان نــەهات
ئیمــڕۆ جــەژنی بــەزم و خۆشــی وا بــەناوی ئێوەیــە
عالــەمیش هاتۆتــە زیــارەت جێژنــە پــیرۆزەت دەکــات

(٤٢)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

رۆژی یازدەی مانگی ئازار بوو بە خۆشی و هاتەهات
موژدەبێ ، ئێزگە لە بەغدا وا بەیانی خۆش ئەدات
زۆر بەخۆشی دەستی پێکرد ئەلموهیب ئەحمەد حەسەن
حازرین بۆ بەندەکان و حەللی جوملەی موشکیلات
قەومی کوردی ببنەیەك دڵ بێ غەرەزبن سەیری کەن
چۆن لە سەر بورجی نەجاحەت رۆژی هیواتان هەڵات
هەوری رەحمەت هاتە ئاسمان بوو بە بارانی سروور
ئەمن و ئاسایش پەیا بوو حوکمی زاتی وا ئەدات
قەت نەما فەرق و جودایی بوونە یەك کورد و عەرەب
بوغز و کینە هیچ نەماوە خاس و عام با تێبگات
ئێمە گشتمان هەر برابووین رۆڵەیی یەك نیشتمان
دوژمنی بەدگۆیی ئێمە با لەداخان گیان بدات
بۆ هەموو تەنگانە دائیم پشتیوانی یەکترین
دەستی دەبڕین هەرکەسێکی دەست درێژکا بۆ وڵات

مـــوڵکی خۆمانـــە عـــیراق و ئەجنـــەبی لێ دەردەکـــەین
دوژمنـــی دیـــن و وەتـــەنمان قـــوڕ بـــە ســـەرخۆیدا بکـــات
گوێ لە من کەن کاکی کوردی چون بـەبێ فـەرقی دەڵـێم
فـــی طریـــق العـــدل ســـیروا لـــیس بـــأس فـــی اللغـــات
فـــــاعلنوا رســـــم الاخـــــوة یـــــا رؤوســـــاءالعرب
خالیـــا عـــن کـــل غـــش صـــادقا کـــل الجهـــات
تیغـــی دوورەنگیـــی ، بزانـــە چـــۆن رەگـــی جـــەرگی بـــڕین
رەنگ و رووتان لێ بـڕا بـوو شـوکرو لـیللا بـوو نـەجات
مرحبـــا اهـــل الجنـــوب لیـــث غابـــات العـــراق
نحـــن نمـــر بالـــشمال والجبـــال الراســـیات
نـــبطش بطـــشا شـــدیدا نحفـــط ارض الـــوطن
دیـــن الاســـلام شـــعار نـــصرنا حـــسن النیـــات
ئینتیـزاری لـوتفی خـوا بـن روو لـە قـاپی ئـەو بکـەن
فاعبـــــدوه ان تحبـــــوا راحـــــةً في کائنـــــات
واتقـــوا یـــوم الجـــزاء وانـــصروا دیـــن الهـــدی
ان تریـــدون النجـــاة في الحیـــاة والممـــات
دوژمنی دین و وەتەنتان قەت بـە خۆتـان خـۆش مەکـەن
بەڵکو (عـاصی ) دڵ رەحەت بێ با خەفەت چیتر نەخوات

* * *

(٤٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

# بۆ نەورۆزی ساڵی ١٩٣٧ ئەوەم نووسی :

مــوژدە بــۆ ئــەربابی ئیمــڕۆ وا بــەهار تەشــریفی هــات
دەســـت کەنـــە شـــایی و زەماوەنـــد رۆژی هیـــوا وا هـــەڵات
رۆژی تـــازەی ســـاڵی نوێیـــە عـــادەتی کـــوردی دلێـــر
کـــاتی خۆشـــتر وا لەپێـــشە غـــەم لـــە دڵمـــان دەردەکـــات
ئینقیلابـــی کـــرد بـــە زســـتان جەیـــشی نـــەرۆز ســـەیری کـــەن
تیـــپ بـــە تیـــپ هـــەروا خەریکـــە نێزەبـــازی وا دەکـــات
خیـــوەتی هەڵـــدا بـــەهارو چـــاوی ســـەرمای واشـــکاند
بەفری سەر چیای لێ بە جێ ما هەند بە گورجی و زوو هەڵات
گـــوڵ نـــەجاتی بـــوو لـــە زســـتان بـــەرگی تـــازەی کردەبـــەر
لەشـــکری غونـــچە و رەیـــاحین بولبـــولیش کەوتـــە خـــەبات
مورغی خۆشـخوانی تەبیعـەت هاتـە نەغمـە و چەهـچەهە
وا لەســـەحراو چـــیاوو گـــوڵزار فەرشـــی خۆشـــی رادەخـــات

ئیتتیحادیـــان کـرد بــه گـورجی لەشـکری رێکــی و بــەهار
تیپــی فیتنــه و فەسـلی زسـتان دەربــەدەر بــوون بــۆ وڵات
ئاسمـــان گریــا لــەناکاو ســـەیلی فرمێــسکی رژانـــد
خـــاکی تینــوو رۆڵـــەکانی کەوتنـــه خەنـــده و هاتـــەهات
روو لــه میحرابــی تەشــەککور وا مەلــەك ســەجدەی دەبــەن
کورد لــه نــاو گێـژاوی فیتنــه حەمـدولیللا بــووی نــەجات
ســـەیری بەیـــداغی دەماغیـــان وا لەبـــەرزایی ئومێـــد
کـــاکی بـــەرزانی چـــەقاندی بـــۆ ئـــەهالی رۆژهـــەڵات
چـــونکه نـــاوی مـــستەفایه بۆیـــه بـــەرزە هیممـــەتی
خادیمــه بــۆ دینــی ئیــسلام حــوکمی شــەرعی وادەکــات
قــەت نــەما فــەرق و جــودایی تێکەڵــه کــورد وعــەرەب
بــوغز وکینــه هــیچ نــەماوە خــاس وعــام بــاتێ بگــات
بــۆ هـــەموو تەنگانـــه دائـــیم پـــشتیوانی یــەك دەبــین
دەســـتی دەبــڕین هــەر کەســێکی دەســت درێـژکا بــۆ وڵات
بــا بــژی کــوردی عیراقــی شــێری نــاو بێــشەی شــەرەف
دەنگی (فلیحیــا العــرب ) بــێ تــا لــه دنیــا دەنــگ بــدات
بــه عــزه شــیعرێکم قەدیمــه مــن بــه ئــەلفازی عــەرەب
تــێ بگــەن بــا گــەورەکانیان کــورد کــه داوای چــی دەکــات

فـــاعلنوا رســـم الاخـــوه یـــا رؤســـاء العـــرب
خالیـــاًعن کـــل غـــش صـــادقاً کـــل الجهـــات
وەرنـــە مەیـــدانی ســـەداقەت داکـــی و بـــابی دوبـــراین
نحـــن اکـــراد الـــشمال لـــیس بـــأس في اللغـــات
مرحبـــا اهـــلا وســـهلا لیـــث غابـــات الجنـــوب
نحـــن نمـــر بالـــشمال والجبـــال الراســـیات
نـــبطش بطـــشا شـــدیدا نحفـــظ ارض العـــراق
دیـــن الاســـلام شـــعار نـــصرنا حـــسن النیـــات
فـــافهموا اهـــل الـــشمال واعلمـــوا اهـــل الجنـــوب
غـــیر دأب الاتحـــاد لا ســـبیل للنجـــاة
مـــا رایـــتم مـــا رایـــتم في النفـــاق بیـــنکم
کـــم قَتَلْـــتُم کـــم قُتلْـــتُم کـــم فتـــی ذاقـــوا الممـــات
نـــارەزان گـــەر بـــەو قـــسانە لـــێم ببـــوورن کاکـــە گیـــان
هەرِبڵێن خەڵفاوە (عاصـی) ســەیری فیکـری چۆن دەکـات

❊ ❊ ❊

(٤٤)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

## لە وەختی پێش رابیتەی مورشید ئەوە بخوێنەوە

وەرە ئـەی دڵ موهەییابـە ئـەوا نـووری هیدایـەت هـات
بـڕۆ ئـەی نەفـسی ئـەمارە شەهنـشاهی ویلایـەت هـات
لـە سـینەی خەسـتەخانەمدا برینـی قەسـوەتت دەرخـە
جەنابی شاهی مورشیدمان حەکیمی پـڕ دیرایـەت هـات
بە چاوی مەعنەوی ئەلئان دەکا کەشفی هـەموو ئەسـرار
خوسووسەن بۆ تەداوی تـۆ ئەوائـەهلی سـەعادەت هـات
نـەبێ باکـت لـە ئـازاری حـەکیمی حازیقـە بـیللا
شیفابەخشی هەموو دەردە بە دەرمـانی سـەلامەت هـات
بـە دەسـتی نەفـسەوە (عاصـی) خـەریکی زارو ئـازاری
ئیمامولواسیلین ئەی دڵ لە سـەر رەسمـی عیـادەت هـات

❊ ❊ ❊

(٤٥)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن (فعولن)
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن (فعولن)
(هەزەجی شەشی تەواو(مەحزووف))

## چومە خزمەت مەلا محەمەد ئەمینی.
## چووم حەیدەری لەویٚ حازر نەبوو
## لەگەڵ بەعزیٚ رەفیق چووبوونە پیاسەی
## منیش ئەوەم نووسی

بەخۆشـــی هـــاتم ئـــەی گـــوڵ ببمـــە خـــارت
ئەســەف قوربــان کــە مــەحرووم بــووم لــە دیــدارت [١]
خـــودا حـــافز لـــە گـــەڵ ئـــەربابی دینـــت
نەکـــەی دنیـــا بکەیتـــە یـــاری کـــارت
لەگـــەڵ ئـــەربابی نـــا ئـــەهلا بـــە جـــاریٚ
دەخیلـــت بم نەفـــەوتیٚ هـــۆش وئـــەفکارت [٢]
ئەگـــەر وابـــیٚ لـــە ســـیٚ لاوە گرفتـــاری [٣]
لەدەست شەیتان ونەفس وهەم رەفیقـی بـەد شـیعارت [٤]
رەفیقـــی بـــەد لـــە شـــەیتان پیســترە بـــیٚ شـــك [٥]
کـــە چـــونکە دوژمنـــە بـــۆ دیـــن و کـــارت

دەخیلـــــە خـــۆت بپـــــارێزە بـــــە جیـــــددی
لـــــە قـــــەول و کـــــردەوەی بـــــەدکاری یـــــارت
بـــە راســـتی خـــۆت نـــەپارێزی بـــە قوربـــان
دەبیتـــە گاڵتەچـــی بـــۆ یـــارو ئـــەغیارت [٦]
تـــــەداوی ئـــــەو برینـــــەت زەحمەتـــــە زۆر
بەغەیرەز فکری پـارێزت بـەوەڵلا قـەت نییـە چـارت [٧]
کـــەوا بـــوو خـــۆت تـــەبیبی حـــاڵی خـــۆت بـــە
بـــە گـــورجی تـــێ بکۆشـــەو لابـــە ئـــازارت [٨]
موتـــابیق کـــە هـــەموو فیکـــرت لەگـــەڵ نـــاوت [٩]
ئـــەمین بـــن تـــا لـــە قـــەول و فیعـــل و ئـــەتوارت [١٠]
وەکـــوو (عاصـــی) مەبـــە بـــێ هـــۆش و بـــێ بـــاك
مـــەدە دەســـت کـــەس دەخیلـــە رازو ئەســـرارت [١١]

* * *

---

١ : ئەم شیعرە پێی کۆتایی لەتەکانی لە نێوان (مفاعیلن) و (فعـولن) دان . هـەموو لەتـەکان سـێ تەفعیلەیین، تەنیا دوو لەتیان چوار (تەفعیلە)ە.

ئەم هۆنراوەیە زۆربەی لەتەکانی لە سەر کێشی (مفاعیلن مفاعیلن فعولن)ـە. لەتەکانی (١، ٢، ٥، ٦، ٨، ٩، ١٠، ١١) تەفعیلەی کۆتاییان بۆتە(مەفاعیلن). لەتەکانی (٤، ٧) هەریەکە چوار پێیە بەلاّم لەتی(٤) کۆتاییەکەی (فعولن) و لەتی (٧) کۆتاییەکەی (مفاعیلن)ـە.

## (٤٦)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

موبارەك بێ بەدڵ خۆشی عەزیزم جێژنی قوربانت
بەرەو خۆشی تەرەققی بێ بە دائیم عومر و عینوانت
لە خوام داوایە تا ماوی لە گشت دەردو بەڵا دوور بی
چ گەردی گەردشی دەوران نەنیشێ قەت لە دامانت
گەیشتە دەستی من بێ شك ژمارەی دوو لەبن سفرێك
نەبێ خاڵی هەتا ماوی بە دائیم دەستی ئیحسانت
لە دڵما نەقشی وا بەستووە ئەتۆ بۆیە نەقشبەندم
زبانی تەعنە کۆتایە لە دەرحەق لوتف و ویجدانت
لە فیکرم ناچی مەعلوومە هەتا مابم لە رووی خاکا
نەشێوێ گوڵشەنی بەختت نەرەنجێن باغ و بوستانت
نەسیمی سوبحی خۆش حاڵی ببێتە پانکە بۆ رووحت
شەرارەی سۆبەیی رەحمەت تەسەللای فەسڵی زستانت
دڵت جانا نەرەنجێتن لە شیعری بێ سەروپێما
لە جەولانگاهی ئیخلاسی کە (عاصی) هاتە مەیدانت

* * *

## (٤٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

ئەی وەتەن هەرچەند کە ئیمرۆ زیللەتی تۆم دێتە یاد
بوویە بەردەست و ئەسیری دائیرەی ئەهلی عیناد
بوویە ڕێباز و گوزەرگای دوژمنی بەدخواهی خۆت
ئەی وەتەن داغی گرانم میللەتت بوونە کەساد
زۆر خەریکم لەم ژیانە من کە ئیستیعفا بکەم
چونکە بۆخۆم وادەزانم عومری زووم ڕۆیی بەباد
بووی بە شەربەت ئەجنەبی دێن وا بەکەیف ئەیخۆنەوە
زەهری میحنەت بۆتە قووتی کوردەکانی بێ مراد
ئەو کەسانەی تاکو ئێستا خزمەتی کوردیان دەکرد
ئێستە بوونە ئیش بە دەست و بوونە جەمشیدو قوباد
باغی تۆ بێگانە هاتوون بوونە گوڵچینی ئەتۆ
بۆیە (عاصی) قوڕ دەپێوێ قەتعییەن ناکا زیاد

* * *

## (٤٨)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان**
(رەمەلی مەشتی مەقسوور)

تێ بفکرن لەم قسانە زۆر بە دیققەت قەومی کورد
تێکچووە ئیقبالی کوردی گەرنەکەن زوو دەست و برد
بووینە حیزو ژێر چەپۆکەی وەحشیانی بێ شعوور
شوهرەتی بەستووە لە عالەم میللەتی کوردی کە مرد
جەهل زیندانە عەزیزان هەرکەسێکی تێی کەوێ
چاکە ئێمەش عیلم و سەنعەت بۆنەجات بیانکەینە پرد
زەهری نارێکی ، بەرێکی و یەککەتی گەر نەیکوژن
هەر بزانە دوژمنی دین غارەتی نامووسی برد
گەر هەموو ئیسلام ببێتە پشتیوانی یەکتری
کەللەیی دوژمن ، بەمستێ دەیکەنە توتیایی ورد
چونکە دەرحەق یەك حەسوون بوونە چارۆکەی حەمام
هەرچی هات کێشایە بەرخۆی وەك زەمانی یەزدی جورد
با خەریك بین ئەی براکان لەم ئەسیرییە بێینە دەر
گوێ نەدەینە فیکری بەدگۆی کافرێکی کەللە گرد
چونکە بۆ خۆی کوردە (عاصی ) وا بە کوردی پێت دەڵێ
زۆر ئەمانت نیشتمان بێ مەیدەیە بەدخواهی کورد

* * *

## (٤٩)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەقسوور)

ئـــەی کەعبـــەیی دڵ مورشـــیدی دیـــوانی نەقـــشبەند
عـــەتتاری گوهەربـــەخش بـــە میزانـــی نەقـــشبەند
غەوواســـی مـــەعانی لـــەبنی بـــەحری حەقیقـــەت
شەهـــسواری ویلایـــەت شـــەهی مەیـــدانی نەقـــشبەند
داینـــاوە لـــە مەیـــدانی شـــەرع گـــۆیی تەریقـــەت
مەعلوومـــە لـــە دەســـت تۆیـــە کـــە چەوگانی نەقـــشبەند
ئیکـــسیرە لـــە خـــاکی دڵـــی وێرانـــەیی مەحـــسووب
جیلـــوەی نـــەزەری غونـــچەیی بوســـتانی نەقـــشبەند
ســـەرحەڵقەیە بـــۆ حورمـــەت و تـــەرویجی شـــەریعەت
جێـــی فـــەخرە لـــە بـــۆ جوملـــەیی پیرانـــی نەقـــشبەند
(عاصـــی) کـــە لـــە گـــوڵزاری دەری تۆیـــە بـــە قوربـــان
قەیـــدی بکـــە تـــۆش بولبـــولی خۆشـــخوانی نەقـــشبەند

❊ ❊ ❊

(٥٠)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

بــە نــووکی خامــە نەقــشت کــرد کــەناری کاغــەزی زەڕتــار
بە جەدوەل سوورەتت کێشا ســەلاحی مــن بەچــەند پــەڕگار
لە ناو سێ پەنجەیی زیــوت قەڵــەم رەشمــاربوو زەهــری رشــت
نەتیجەی زەهری شەککەر بوو مــەفادی حــەرفی جەوهــەردار
سەدەف حەرفی موجەوهەر بوو بە مەعنا دوڕڕو گەوهەر بــوو
لە تەعما شەهدو شەککەر بوو لە ئەئسیر شــیری جەوهــەردار
کە غونچەی لێوی تۆ پشکووت لــە گــوڵزاری نەجابــەت تــا
دڵی بولبول خرۆشی کــرد کــە گــەنجی لــوتفی بــوو ئاشــکار
بە قەد دوو قاتی پیتی ئەو هەمە من عــەرزی ئیخلاســی [1]
دوعــاگۆیی و سەلام ناردن ئــەوا دەرچــوو لــە چــەند میلیــار
زەخیرەی بــەختی (عاصــی) بــوو ســەلام و لوتفەکــەت جانــا
لــە ئــەوجی ئاسمــان دەخــشێ کــڵاوی فــەخری مــن ســەدبار

* * *

[1] لە پەراوێزدا نووسراوە : (لەیادی بەندە دەرناچێ بە چاوی دڵ هەموو وەختێ ).

## (٥١)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەقسوور)

تاکەی لە خەوی غەفڵەتی ئەی کوردی سیە ه چار
بێ ئیش و پەراگەندەوو مەحزوون و خەفەتبار
بێگانە لە هەرلاوە کە ئالاوە لە لاقت
فەوتاوی بە مەودایی رم و خەنجەری ئەغیار
تێ بفکرە[1] چون زەهری نیفاق جەرگی رزاندی
کردۆتە شەڕ و فیتنە بە دەستوور و بە رەفتار
ئەم میللەتە بێچارە بە جێماوە لە عیرفان
بێ سەنعەت و بێ حورمەت و بێ عیززەت و غەمبار
کەوتوویەتە ژێر بەحری غەم و مەوجی نەدامەت
بێ فیکرو پەراگەندە لە سەحراوو لە ئەقتار
داخوازی بکەن لاوی وەتەن بکرێ سیناعەت
ئەولادی زەفەر بێتە وەتەن عارفی هوشیار
چارەی نییە (عاصی) کە لە تاو ئێوە دەگریا
بێ هۆش و سەرەفگەندە وو بەدناوو گرفتار

* * *

[1] ئەم لەتە دەبێ خوێندنەوەیەکی تایبەتی بۆ وشەی یەکەمی بکرێ ، نەوەك لەنگ دەردەچێ ، دەبێ بخوێنرێتەوە: (تێ \ بڤ \ ك \ رە )

## (٥٢)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

**گـوڵ نـەجاتی بـوو لەزسـتان بـەرگی تـازەی كـردە بـەر**
**لەشـكری غونـچە و رەیـاحین بولبـولیش هاتـە خەبـەر**
**مـورغی خوشخوانی تەبیعەت هاتە نەغمە و چەهچەهە [١]**
**وا لە ناو گـوڵزاری سـولحا تـاجی عیـشقی نایـە سـەر [٢]**
**ئیتتیحادیـان كـرد بـە جـاریٚ لەشـكری رێكـی و بـەهار**
**تیپی فیتنـەو فەسـلی زسـتان دەربـەردەربوون بـیٚ ئەسـەر**
**رۆژی یـازدەی مـانگی ئـازار كـورد چـە ئـازاری نـەما**
**بوو بەیەك رەنگ هەرچی كـوردە وەك پڵـنگ و شـێری نـەڕ**
**ئـەم سـكەندەر شـێوە یـا خـوا هەربـژی بـۆ كوردەكـان**
**كەڕڕو فەڕیان هەر زیاد بـیٚ حیـشمەت و ئـاڵاتی شـەڕ [٣]**

---

[١] لە دەستنووسێكی دیكەدا ، لەباتی (تەبیعەت ) نووسراوە (وەتەنمان )
[٢] لە دەستنووسێكی دیكەدا ، لە باتی (تاجی عیشقی..) نووسراوە (بەرگی یەك رەنگی لەبەركرد.)
[٣] ئەم لەتە لە دەستنووسێكی دیكەدا بەم جۆرەیە ( كەڕڕو فەڕڕی هـەر زیـادبیٚ حیـشمەت وفـەزڵ وهونەر )

ئاسمـــان گریـــا لـــه ناكـــاو ســـه‌یلی فرمێـــسكی رژانـــد[1]
ئـــه‌رزی تینـــوو و رۆڵـــه‌كانی كه‌وتنـــه خه‌نـــده ده‌شـــت و ده‌ر
روو لـــه‌میحرابی ته‌شـــه‌ككور وا مه‌لـــه‌ك ســـه‌جده‌ی ده‌بـــه‌ن
كـــورد له‌ناوگێـــژاوی نه‌كبـــه‌ت وا ســـه‌ری هێنایـــه ده‌ر
ڕووحی دڵنه‌رمی لـــه لایـــه‌ن ئیش به‌ده‌ســـتان هاتـــه دی[2]
میحـــوه‌ری بـــوغزو عـــه‌داوه‌ت وا بناغـــه‌ی هاتـــه ده‌ر
وه‌ك له سه‌رچـــاوه‌ی لـــه تافـــه‌ت ئـــاوی عـــه‌فوی هـــه‌ڵقولاّ[3]
بو به‌یه‌ك تیپ قه‌ومی كـــوردی خـــاوه‌نی فـــه‌زڵ و هونـــه‌ر[4]
حه‌مدولیللا خواســـتی (عاصـــی) زۆر بـــه چـــاكی هاتـــه‌دی
نۆســـه‌دو حـــه‌فتاوو یـــه‌ك بـــوو هـــه‌م هـــه‌زاری بێتـــه ســـه‌ر

**١٩٧١**

❊ ❊ ❊

---

[1] له ده‌ستنووسێكی دیكه‌دا له‌باتی ( له‌ناكاو ) نووسراوه به‌(جاریّ).
[2] له ده‌ستنووسێكی دیكه‌دا ، له‌باتی (ئیش به ده‌ستان )، نووسراوه ( گه‌وره‌كانمان).
[3] ئه‌م له‌ته له ده‌ستنووسێكی دیكه‌دا به‌م جۆره‌یه: ( وا له سه‌رچاوه‌ی له تافه‌ت ئاوی عه‌فوی هه‌ڵقولیّ).
[4] ئه‌م له‌ته له ده‌ستنووسێكی دیكه‌دا به‌م شێوه‌یه‌یه : ( تۆوی یه‌كگرتن له ناو كورد گه‌ییه ئه‌فلاكی هونه‌ر ) .

## (٥٣)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

تابەکـەی نووسـتن بـە غەفڵـەت بـەرگی بێبـاکی لەبـەر
رووح خـەریکی ئەلویداعـە ئـەی بـەدەن خاکـت بەسـەر
دەفعـەیێك فیکـرت نـەکردو عیبرەتێکـت وەرنـەگرت
هەر بـەرێگای بـێ شـعووری عـومری خـۆت وابردەسـەر
حـەزرەتی قـابیز لـە دواتـە دێـت و دەقولبابـەکا
هەسـتەکاتی ژیـان تـەواو بـوو رووحـی شـیرین دێتـەدەر
نووکـە نـووك و پرتـە پرتـی عائیلـە و مـاڵ و منـاڵ
کـەلکی تـۆ نـاگرن بزانـە چـی دەکـەی ئەینەلمەفـەڕ
پـشتیوانی تـۆ عەمەلتـە گـەر ئـەتۆ چـاکەت هـەبێ
وەر بـە بـەدکاری ژیـابی وای لـە مەیـدانی خەتـەر
خاك وخۆڵـە ژێـری لاشـەت فەرشـی قـەعری قەبرەکـەت
چەند گەزێکـە تـۆ لیباسـت مـەل مـەل و بـاقی هـەدەر
پاشـی چـەند رۆژێ دەبینـی دەبییـە قـاوەڵتی کـرم
رەنـگ و روخـسارت دەبینـی داخـۆ چـی هـاتووە بەسـەر

ئـەو زبـان و چـاوە جوانـەت سـەیری کرمـی ڵـی ئـەدا
مووخی ئێسقانت دەخـۆن و نـامینێ قـەت هـیچ ئەسـەر
ئەو خودایەی تۆی دروست کرد زیکر و فیکری ئەو بکـەی
تـۆش دڵـت بەردایـە دونیـا لـەم هەواڵـە بـێ خەبـەر
حـاڵی دونیـا هەروەهایـە بـێ وەفایـە تـێ بگـە
روو لە خواکـە قـوڕ بپێـوە بـێ دەمـاغی هـەش بەسـەر
تـازە دونیـا بۆتـە گوڵـشەن تـۆش دڵـت هـەر بولبولـە
زۆر لە خۆت وریابە (عاصی ) سەختەرێگات بـۆ سـەفەر

*  *  *

(٥٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

قەوم و میللەت تێ بفکرن نیشتمان چی هات بەسەر
بەردی بنچینەی وجوودم وا خەفەت هێنایە دەر
خاك و بەردو دارو ئاوی ئەورووپای و ئەجنەبی
چەند هەزار نەوعە مەعادین وا لەوان هێنایە دەر
لەم هەموو ئافاقی دونیا چونکە کورد ئێکی نەگرت
سەیری کەن مادوونی خۆیان دەردی چۆن هێنانە سەر
تا بەکەی رازین بە زیللەت لەم مەقامە کاکی کورد
چاو لە دەستی ئەجنەبی بن بێ مراد و قوڕ بەسەر
شوهرەتی وابوو لە دونیا ئەورروپا بەحسیان دەکرد
فیلحەقیقەت بۆ شوجاعەت قەومی کوردە شێری نەڕ
وا بزن مشك وپشیلەو پیستی ماری ئێمەیە
ئەو بە قووەی عیلمی سەنعەت دەیکەنە ئالاتی شەڕ
کلکی ریوییە چورچی ئێمە کەوڵی فەخرە بۆ ئەوان
پێستی سەگ کەوڵی دەڵەکمان زینەتی ئەهلی کفر

ئــەم هــەموو دەرمانــە وادێ گیــای ولاتــی ئێمەیــە
دەیکــڕین لــەو دوژمنانــە وا بــەزێڕی سەربەســەر
...ی غەم ناخوا لە ئێوە (عاصی) وەك سەیری دەکا
...تۆمــۆبیلی کــە هێنــا ئــەو لــە بــاتی نێرەکــەر

* * *

## (٥٥)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

مەرحـــەبا ئـــەی کاکـــە ئەحمـــەد پـــشتیوانی پـــڕ هونـــەر
پیـــشتیوانت بـــێ لـــە قیامـــەت ئەحمـــەدی خەیرولبەشـــەر
قـــەت نـــەبینی دەردو میحنـــەت تاکومـــاوی ڕووحەکـــەم
هەربەخۆشـــی و شـــادمانی ژیـــانی خۆشـــت بەریەســـەر
وا لـــــەباغی لـــــوتفی ئێـــــوە چـــــاوەڕێی هیوادەکـــــەم
زەوقـــی شـــیرینی بـــچێژم تـــا لـــەمیوەی خـــۆش خەبـــەر
بـــەوگلۆپی کارەبایـــەی حوســـنی خولقـــت چـــاوەکەم
شـــەوق و ڕوونـــاکی بفـــەرموو ئـــەم دڵـــەی واپـــڕ خەتـــەر
ڕێی ئومێدی ڕوونە (عاصی ) بـەو چـرایەی وەعـدی تـۆ
تـــۆش بـــە قادرمـــەی نـــەجاتا بـــچیەسەر کورســـی زەفـــەر

❊ ❊ ❊

## (٥٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

هەند حەسوودە چەرخی گەردوون دەرحەقم کەوتۆتە شەڕ
ئاشی بەدبەختی بە ئاوی نەکبەتی خستۆتە گەڕ
سواری ئەسپی غەم بو دڵ تەعقیبی بەختی بەد ئەکا
شاهیدا بێدار ببیتن لەو خەوی ئاشووب وشەڕ
بردمیە گێژاوی غوربەت دوور و ئاوارە لە یار
رووتی کردم چەرخی چەپگەرد وەك مەلی بێ باڵ و پەڕ
هۆشی لێ گرتم بە غارەت لەشکری غەم بێ تەقە
دایە بەر تۆپی مەرارەت تێکی داوە بەخت و فەڕ
دەفعەیەك بێدار بە ئەی بەخت دەستی من دامانی تۆ
با لەگشت جێگا نەناڵم وەك هەتیوی بێ پدەر
بەسیە هوشیار بە دەخیلە عەقڵ و جەوهەر بێ بەهان
گەر فەرەیدوون بێ بە جەوهەر هەرکەمێ بێ سیم و زەڕ
(عاصی ) تۆ هۆشت لە خۆبێ تەخت و بەخت بێ فایدەیە
بۆچی غەم خواردن لە دونیا ئاخە ئاخ و چاوی تەڕ

* * *

(٥٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

**(ئەم تەشەککور نامەیەم نووسی بۆ خزمەت قائیمقامی کۆیسنجەق (عەلی سلێمان بەهار) کەلەساڵی ١٩٧٠ هاتە کۆیە و دەستی بە خزمەت کردنی کردو بازاڕو چەند کۆڵان و مەیدانی خوارێی کۆنکریت کرد کە بەمەزبەلە دەچوو . ئەم شیعرانەم تەقدیم کرد ) لە جێگایەکی دیکەی دەستنووسەکانیش ئەم پێشەکییە بۆ شیعرەکە نووسراوە:**

(ئەم تەشەککورنامەیە لە لایەن مەلا مستەفا(عاصی) بۆ خزمەت قایمقامی کۆیە کاك (عەلی سلێمان بەهار کە ساڵی ١٩٧٠ هاتە کۆیەو دەستی کرد بە خزمەت کردن و رازاندنەوەی شارەکە بە جۆرێك ئەگەر بەرامبەر بکرێ لەگەڵ پێشوودا نموونەیەکە لە لبنان و پاریس. منیش لەبەر ئەو خزمەتەو ئەو لوتفەی کە بەبێ داواکردنی من، بەزەیی بە حاڵی مندا هات و گلۆپێکی لە رێبازی تاریکەکە خست-خودا چاوو دڵی ڕووناك بکا-ئەوەم نووسی و لە دوای ئەوەش ویجدانی پاکی خستییە فیکری ئەوەی کە ئەو مەیدانەی لە ناوەندی شاردایە هەتا ئێستا مەزبەلە بوو،عەزمی بەهێز کردو دەستی کرد بە کۆنکریت کردنی بازاڕو کۆڵانەو مەیدان و کردنی بە لەوحەی بلوور. لە پاك و خاوێنیدا لاسای شارەکان دەکاتەوە،بەڵکو زیاتر، خودا دڵ و دەروونی و رووحی خاوێن بکاتەوە بە لوتفی خۆی و لە دنیاو قیامەت ئەهلی نەجات بێ و ئومێد وایە لە قاپی خودا لە ئیتاعەی ئومووراتی ئیلاهی ناجیح و پێشکەوتوو بێ و واجیباتی شەریعەتی ئیسلام بە تەواوی موحافەزە بکات و بە جێیان بێنێ ئینشائەللا،هەتا لە مەیدانی قیامەت سەربڵندو بە حورمەت بێ.ئیتر بە خودای دەسپێرم.ئەم تەشەککورنامەیە بە شیعر عەرزتان دەکەم).

هیمـــەتی قایمـــەقامی ســینە پـــاك و پــڕ شـــعوور[1]
هـــات شـــەوی بـــۆ کردمـــە ڕۆژ و ساحەشـــی کـــردە بلـــوور
شـــێری نـــاو بێـــشەی دیرایـــەت مهرەبـــان و دڵنـــەواز
ســـەر بڵنـــدو ئـــیش گـــوزارو چـــاو نـــەترس و زۆر جەســـوور
فـــەخرە بـــۆ کۆیـــە بمێنـــێ تالـــە مێـــژوو دەرکـــەوێ
مەزبەلەی کردن بـە گوڵـشەن چەشـنی دەشـتی شـارەزوور
نایەتـــە عـــەددو حیـــسابیش قیمـــەتی ئەوخزمەتـــە
گـــەر قەلـــەم بیخاتـــە دەفتـــەر دێتـــە ملیـــار و کلـــوور
کاك عەلی بـۆ شـاری کۆیـە وەك سـلێمان هاتـە دەسـت[2]
شـــارو دەورەی کـــردە گـــوڵزار وەك بـــەهاری مێرگەســـوور
کارەبـــای لـــوتفی بـــەکار خـــست نـــاوی تـــاریکی نـــەما
ڕەهگوزەرمان ئەم بـەرە و بـەر بـوو بـە ڕۆشـنگاهی نـوور
قوڕ بەسەر قوڕ چی بەسەر هات قوڕ بەسەر خۆیـدا بکـات
کەوتە ژێر بـەردو چـەمەنتۆ بـوو بـە جێگـای مـارووموور
جـادە وو کـۆڵان و بـازاڕ هـیچ گـرێ و قـۆرتی نـەما
کوێر بە بێ گۆچان و دارەدەست پیا دە چن[3] نێزیـك و دوور

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە باتی (شعوور )، نووسراوە( مشوور).
[2] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە باتی (بۆشاری )، نووسراوە(رووی کردە).
[3] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە باتی (پیا دەچن )، نووسراوە (روودەکا ).

دارو بــەردی خــاکی کۆیــە شــوکری لــوتفی ئــەو دەکــەن
کردییــە لبنــان و پــاریس تــێ بگــەن ئــیران و تــوور
رۆســتەمی مەیــدانی غــیرەت ســواری رەخــشی عیززەتــە
وا لەچــنگی خزمەتایــە بــۆ بینــاو قەســرو قوســوور
دەم بــە خەنــدە لەهجــە شــیرین عاقــڵ و ســاحیب شــعوور
گەردی گەردش هــیچ نەنیــشێ قــەت لــە گــەردوونی دڵــی
هەر لــە شــەوقا بــێ ستارەی بــەخت و ئــایینی بــە نــوور
(عاصــی) تــا مــاوە بەراســتی هــەر دۆعاگۆتــەو دەڵــێ
ببنــە پارێزگــاری رووحــت غەوســی بەغــدا و پیرمەســوور

## (٥٨)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

دەوڵەمەند و ئەهلی دونیا قەت مەکەن فیکری غروور
وا ئەجەل کەوتۆتە شوێنتان دائیما نێزیک و دوور
ڕۆژی دوێنێ چوو لە دەستت بۆ سبەش مەعلووم نیە
فورسەتە ئیمڕۆ خەریك بە بۆ نەجات ڕۆژی نشوور
چاوی عیبرەت دانەوێنە سەیری بەرپێی خۆت بکە
بوونە خاکی ژێری پێت و ساحیبی قەسرو قسوور
باغ و باغچە و میوەجات و زینەتی دنیا نەما
بارەگای پاشاو وەزیران بۆتە جێگای مارومور
ڕێی پەشیمانی گوناحان بگرە تا ماوی ئەتۆ
دڵ بەزیکری خوابشۆوە بیکە یەك پارچە بلوور
لاپەڕەی مێژوو ببینە سەیری دنیا و گەورەکان
تاقی کیسرا عیبرەتێکە بۆ کەسی ساحیب شعوور
یانەخۆ فیرعەون و نەمروود کەوتنە داوای خوایەتی
وەك سەگی تۆپیو کەڕۆین وا بەرێگەی ژێر و ژوور

بـۆ سـبەینێ رۆژی قیامـەت تـا بـە رووسـووری بـچی
سـەربڵندو بـێ تـرس بـی بـۆ حیـساباتی حـزوور
خـۆت بپـارێزە عـەزیزم تـۆ لـە تەعنـەی دیـان و جـوو
نەك وەکوو یەك بـن لـە سـووتان پێکـەوە بـچنە تـەنوور
حـەزرەتی فـەخری ریـسالەت بـۆ ئـەتۆ عـاجز دەبـی
تۆش حەیاکە کاکی (عاصی) بەسیە گریە و لـوورە لـوور
زۆر بـەوردی تـێ بفکـرە چـت بەسـەر دێ چـاوەکەم
تا لە سەر خۆیە دەماغـت خـۆت بکـە عەبـدی شـەکوور
تـۆ لـە بـاتی فـەرش و وەرتـە سـۆبەوو هـەم کارەبـا
بـەردی سەرسـەنگ و تەنیـشتە دیوەخـانی تـۆ قبـوور
(عـاصی) تۆش عـاقڵ بە بەسیە گاڵتەچی شەیتان مەبـە
تاکوو رووحـت دەردەچـێتن بیکـە ویـردت یـا غـەفوور[1]

❊ ❊ ❊

[1] لە دەستنووسێکی دیکە دا ، دێڕی کۆتایی بەم شێوەیە هاتووە :
(عاصی بەسیە بێ حەیایی زۆر لە خۆت وریابە تۆش
بیکە ویردی سەرزمانت یارەحیم و یا غەفوور ).

(٥٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

یا رەسوولەللا فیدات بم سەروو بالاّ روچراغ
یا حبیبی منذ جئت ما علیك الا البلاغ
بر شکستی در تولد طاق کسری از شکوه
بۆنی روی تۆ بوو کە جەننەت جملە بوو گولزارو باغ
في زمان شمس وجهك في الرسالة طلعت
بۆ دلّی ئەهلی ضەلالەت تۆ وجوودت بوو بەداغ
مانجامن قهر ربی غیر من تشفع لهم
منکیرانت درقیامت جملە دارند روی زاغ
(عاصی)ا از کید نفست تا بکی ایمن شوی
مەسئەلەی مەشهوورە قوربان پێستی سەگ نایبی دەباغ

❊ ❊ ❊

(٦٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

مـژدەبێ بـۆ عاشـقانی غـەمزەدەی غوسـسەی تـەریق
داخیلـی بەدروحونـەینن بـۆ شـەهیدانن رەفیـق
لەم غـەزای دەریـایی عیـشقە جـان فیـدابوون تـێ بگـە
رۆژێ قیامـەت خوێنی جەرگیان دێتە خـوارێ وەك عـەقیق
شـاهیدی رۆژی جـەزایان پەنجـەیی مەعـشوقەیە
جەرگی کـردوون پارەپـارە خـستیە نـاو دەریـای عـەمیق
هەسـتە ئـەی مفتـی بفـەرموو بـا کفنیـان بۆنەکـەن
تا لەعەرسەی حەشـر دیـار بـن تـەن شـەهیدانی تـەریق
بـۆ ئیـشارەی تـیری دڵبـەر (عـاصـی) جـەرگی گرتـووە
چـاوەڕێی خوێنـە بڕێـژێ دڵبـەری شـەهلا شـەفیق

* * *

(٦١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

## لە ٢٥ ی شەوالی ١٣٩٧ ئەوەم نووسی .
## لە بیارەی بووم .
## حەزرەتی شێخ عەلائەدین چوو بووە ئەحمەد ئاوا
## زۆرم ئارەزووی ئەوکرد

مـــن بـــەعینوانی گـــەدایی هاتمـــە دەرگـــەت بـــۆ ســـوئال
کەوتمـــە زنـــدانی فیراقـــت بـــێ نـــەواوو بـــێ مـــەجال
چونکە دڵ کوێرە لـــە رێگـــەی مەعریفـــەت دوور کەوتـــەوە
دائیمـــا هــــەر ئینـــتیزارە چـــاوەڕێیە بـــۆ ویـــسال
گەر لـــە مـــەغریب بـــۆ دڵـــی مـــن ئافتـــابی رووت هـــەڵێ
دیـــارە تەوبـــەی مـــن قبووڵـــە بـــێ خـــیلاف و بـــێ جیـــدال
روو لە کێ کەم بۆ تەشەککی بچمە کوێ ئەی شاهی من
یا لە دەست جەوری فیراقـــت چـــۆن بنووســـم عـــەرزو حـــاڵ

جێـــژنی قوربانــــه بــــه قوربـــان بــــێ چـــراو بـــێ نــــووره دڵ

فەقری دڵ مــــەجبووری کــردم لام نــــەما عـــەقڵ و کـــەماڵ

شـــاهی مـــن عـــادەت وەهایـــه شـــا کـــه جێژنانـــەی بـــدەن

دڵ گــــەدایی دەرکـــی خۆتـــه تـــۆش شەهنـــشاهی جـــەلال

چـــونکه (عاصـــی)م و خەجاڵـــەت وا پـــەنام هێنایـــه لات

چـــاوەیی ئـــاوی حەیاتـــــه بـــــۆ منـــــی ئاشـــفته حـــاڵ

❊ ❊ ❊

(٦٢)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

دایــه دەســت بــازوویی قــودرەت وا قــەزا تیغــی ئەجــەل
لەشــکرو هێــزی ژیــانی یــەك بەیــەك کــردن فەشــەل
دەســت و چــاوو لاق و ئــەژنۆ ســمت وبــێ تاقــەت بــو ون
گــشت زەلیلــی دەردی پیریــن وەك ئەســیری (فــی المثــل )
هەنــده بــێ هێــزو زەبــوونن غیرەتیــان تێــدا نــەما
دەشــت و ســەحرایان لــه بەرچــاو بۆتــه هــەوراز و جەبــەل
چت له ئێمەو چت له خۆت کرد پــێم دەڵــێن ئــەی نابــەکار
ئێمه بۆچی خەلق بووین و چۆن بــه ئێمــەت کــرد عەمــەل
نەفــسی خــۆت کــرده ڕەئــیس و ئێمەشــت کــرده غــولام
تــا لــەجێی گــەنجی عیبــادەت ڕێــی هــەوات کــرده بــەدەل
خاك به سەر ئێمه له دەست تۆ قوڕ بەسەر تۆش ئەی نــەفام
چــۆن بــچینه ڕوویــی مــەولا شەرمەســارو پــڕ زەلــەل
وازی لێ بێنــه لــه دونیــا دوژمنێکــی خــۆی نییــه
ڕوو لــه مــەولا کــه لــه مــەولا موخلیــسانه بــێ خەلــەل

ئـەم عـەجووزە شـێوە قەحپـە تـازە خـۆی کردۆتـە بـووك
تـۆوی حیرسـت پـێ نەچـێنێ نەچییە نـاو داوی ئەمـەل
عـومری خـۆت بێنـە ژمـارە بێنـە بەرچـاو کـردەوەت
گەوهەری گەنجی ژیانـت سـەرفی چـت کـرد بـەد عەمـەل
ئەی دەماغ و کەللە خالّی چت لە خـۆت کـرد بـێ شـعوور
بـۆ تیجـارەت نەقـدی خـالیس هـەر رەواجـە نـەك دەغـەل
عوجب و مـەغروری و تەکەببور هەم ریاو بـوغز و حەسـەد
سـەیری شـەیتانیان پـەیا کـرد مەزهـەری کفـرو جـەدەل
ئەشهەدو بیللا لە دونیـا بـێ حـەیا بـووی (عاصـی ) یـا
بـێ وەفـابووی دەرحـەقی حـەق رووڕەشـی پـیس و زەغـەل

* * *

(٦٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## لە ساڵی ١٩٤٢ چوومە کەربەلا
## بۆ تەداوی رەعنای کچم
## لای دکتۆر (رەفیق تاهیر چەلەبی ).
## لەویٚ ئەوەم نووسی . زۆر عاجزبووم

دەربەدەر بووم من لە دونیا کەوتمە ناو شیعەو عەجەم
بیٚ حەواس و فیکرو هۆشم دڵ مەلوول و پڕ لە غەم
دائیما وەك گیٚژ دەسووڕیٚم بیٚ زمان و بیٚ رەفیق
کەربەلا دامیٚنی گرتم بوو بە دڕکی پڕ ئەلەم
چون لە دڵما بوو بە حەسرەت ئەم بەهارەی شاری کۆ
جەننەتە ئیٚستاکە دەوری گشت بە غونچەی تازە دەم
وا لە هەر چوار دەوری شاری میٚرگەکان رازانەوە
نەرگس و نەسرین و لالە هەم بنەوشەش وا لە چەم
ئەی رەفیقی میهرەبان و وەی تەبیبی حاڵ زان
زوو بدە توخودا نەجاتم خوا نەجاتت دا لە غەم

چڵکنی و گەرماوو کێچ و میحنەتی دووری وەتەن
لەشکریان کردووە لە رووحم هەروەکوو جەمشیدی جەم
کێچ دەڵێ خوێنت دەخۆم و چڵکنی پیستی رزاند
شیددەتی گەرما بە جارێ بۆ دەماغم بوو بە سەم
را دەبوێرم من لەگەڵیان گەر دڵم ساکن ببێ
جەرگی سووتاندم بە جارێ خۆ برینی جەرگەکەم
ئاگری دووری هەمیشە قرچەقرچی خستە دڵ
تێکی دا نەیهێشت بە جارێ هیچ بناغەی عومرە کەم
غەم دەخۆم و زەجرەنۆشم من لە شاری کەربەلا
بیست و دوورۆژە حیسابی حەسرەتم ناکا قەڵەم
چارە هەر تەسلیمە ( عاصی ) چی بکا موختارە خوا
چت لە دەست دێ هەستە بیکە رامەوەستە زۆر و کەم

❊ ❊ ❊

## (٦٤)

(مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن)
(مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن)
(هەزەجی هەشتی تەواو)

موسلمانان چە رەمزێکە دڵم بێدارە من ئیمشە و
بە یادی چاوەکەی ساقی دڵم هوشیارە من ئیمشە و
سەبا مژدەی بە دیتن دا لە بۆ گوڵشەن کە دێ بولبول
لە زومرەی عاشقان بێ شك دڵم سەردارە من ئیمشەو
هەموو کەس بۆنی یاری خۆی لە لا رەیحانە یا نەرگس
لە سایەی کوڵمەکەی ساقی گوڵم دڵدارە من ئیمشە و
گەلێ کەس کەسبی عیشقی کرد لە بازاڕی حوسن ئەمما
لەسەر دووکانی رەمزی عیشق دڵم عەتتارە من ئیمشەو
هەموو کەس گەرچی وەك (عاصی )گرفتاری ئەتۆن لێکن
لە مەیدانی عوبوودییەت دڵم شەهسوارە من ئیمشەو

(٦٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## بەناوی خەوف و رجا نووسیومە لەخودا داوادەکەم لێی قبول کردبم بە رەحمی خۆی

یا ئیلاهی چوو لە دەستم ژیانی دونیا و سیحەتم
زۆر دەترسێم من لە قەهرت هەم بە هیوای رەحمەتم
چونکە بۆخۆم خۆم دەناسم تاعەت و چاکەم نەبوو
ئایەتی (لا تقنطوا )شت بەرزی کردووە هیممەتم
رووڕەشی رۆژی حیسابم گەرنەکەی رەحمێ بەمن
قابیلی هەر نەوعە زەجرم لێوەشاوەی زیللەتم
ئیقتیباسی روومە رەش بوو دەفتەری ئەعمالەکەم
نووری ئیمانە عیلاج کا ئەم دڵەی پڕ قەسوەتم
رێی نەجاتم زۆر بەترسە نەفس و شەیتان رێگرن
شیری تەوحیدە سیلاحم بۆ دیفاعی وەحشەتم
خۆت دەزانی لوورە لوورمە وەك سەگی برسی خودا
گەه لە ترسی ناری دۆزەخ ، گەه لە شەوقی جەننەتم

هەرچی هـەم هـەر عەبـدی تـۆم و ئوممـەتی پێغەمبـەرم
وا لــەناو گــوڵزاری ئیمــان نەغمــەخوانی وەحــدەتم
بەحری بـێ پایـانی رەحمـت گـەر بـە عـەفوو مـەوجی دا
زوو بـە زوو مـەحوو دەکـاتن نوختـەیی زێـی زەحمـەتم
گەر کلیلی لوتـف و عـەفوت دەرکـی رەحمـەت هـەڵگرێ
مــن بـە ئومێـدی لیقـاتم نـەك بـە هیـوای جەننـەتم
گەرچــی بــەدکارم خودایــا مــن ئۆمێــدم قایمــە
چــونکە هاونــاوی شــەفیعی (عاصــی ) یــانی ئوممـەتم
مــستەفایە نــاوی عەبـدت ئیـسمی فـەخری عالەمـە
لێوە شاوەی لوتف و عەتفم گەرچی (عاصی)یە شـوهرەتم

## (٦٦)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

موددێکــە کــە سەرگەشــتەوو حــەیران و حــەزینم
ئــاوارە وو سەوداســـەرو هــــەم گۆشــــە نــــشینم
تاریکــە دڵـــی خـــستە لـــە ژێـــر هـــەوری قەســاوەت
لـــوتفێ بکـــە ئـــەی جلیـــوەدەهی روویـــی زەمیـــنم
ئـــەی تـــوررەیی ســـەر لەوحـــەیی ئیـــدارك و یـــەقینم
خنکـــاوە لـــە گێـــژاوی غـــەزەب ئوممـــەتی بێـــچار
رەحمـــێ بکـــە ئـــەی مـــوهبیتی جبریلـــی ئـــەمینم
بـــێ تاقـــەت و بـــێ تاعـــەت و بـــێ پـــشت و پـــەناهین
ئـــەی فـــەخری ریـــسالەت وەرە ئـــەی حـــەبلی مـــەتینم
ئـــەی قائیـــدو ســـەر لەشـــکرو ئـــەی شـــاهی نوبـــووەت
وا کـــاتی مـــەدەد هـــاتووە بـــۆ ئێـــشی بـــرینم
مـــن پـــیرو ســـتەمدیدەوو بـــێ هێـــزو زەبـــوونم
واشـــیری ئەجـــەل هـــاتووە بـــۆ گـــەردەنی ژیـــنم

(...) جۆشـــشی ئـــەم شۆڕشـــە وەك ئـــاگرە قوربـــان [1]
ئـــەی شـــافیعی دیـــوانی جـــەزاو رەهبـــەری دیـــنم
دەفعێکـــی لـــە روی لوتفـــەوە ئـــەی شـــافیعی (عاصـــی )
کافیە گەر مەیل بفەرمووی بە خـودا قیبلـەیی دیـنم [2]

[1] ئەم لەتە دێرە لەنگە . لە سەرەتاوە بڕگەیەکی درێژی کەمە.
[2] ئەم لەتەدێرە پێی سەرەتای (کافیە)ی زیادە. ئەمە لەعەرەبیدا (خزم)ی پێ دەگوترێ.

## (٦٧)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەولو)

دەخیلـەك یارەسـوولەللا بگـە فریـام بـە جـێ مـاوم
حەقیقەت روورەش و (عاصـی)م و لـیکن مـستەفا نـاوم
بـە ئۆمێـدی خـەلاتێکم لـە لایـەن مـەخزەنی لوتفـت
کـە چـونکە پـیرو ئوفتـادەم گـەلێ پێویـست و دامـاوم
لـە نـاو مزگـەوتی مـاڵی خـوا ئـەوا حەفلـەی ولادەتتـە
مەلـەك خزمەتـچیە ئیمـڕۆ منـیش هەربۆیـە وەسـتاوم
پـەنا بـۆکێ بـەرم قوربـان ئەگـەر تـۆ نەبییـە پـشتیوان
لە دەست نەفس و لە دەست شەیتان گرفتاری دوسەد داوم
ئەوا عومرم هەموو رۆیی لە دەست دونیـا حەیاشـم چـوو
لە دوای نێـچیری بـێ شـەرعی وەکـوو تـاژی بەهەشـتاوم
لـە دامێنـت نـەوەك بـەربێ دەخیلـە دەسـتی ئومێـدم
بکـە چـارەی برینـی دڵ کـە عـەقڵ و هۆشـی تێکـداوم
هـەواوو جیفـەیی دنیـا بـەبێ شـك یـا رەسـوولەللا
حـەیاتی مەعنـەویان بـردم ئەمـەل وارووحـی کێـشاوم
لە تاریکی شەوی غەفڵـەت سـەرم دەرناچـی بـۆ هـیچ لا
تەبیبـی حـاڵزانی مـن عیلاجێـك بـۆ دڵ و چـاوم

قوڕی کوێ کەم بەسەر خۆما ئەگەر خۆت نەبییە غەمخوارم
ئەمن هەر ئوممەتی تۆمە بە گوێرەی ئولفەت وناوم
سەگی دەرگاهی خۆتم من دەخیل خوێڕیم مەکە قوربان
سەگی دەرگاهی تۆ بێتن لە مەحشەر شوهرەت و ناوم
لە حاڵت بۆنەپرسیم تۆ گەلێکم زگ بە خۆم سووتا
بە پەیکانی موژەی تۆیە کە چەندین وەختە پەیکاوم
سەرم دانا لە بەر پێتا لە باتی بەردەباز قوربان
بە سەرگەردی بنی پێت بم وەرە داینێ لە سەرچاوم [1]
بە چاوو دیدەیی گریان بە عومری زۆر و دڵ بریان
لە قاپیت کەوتووم قوربان ببینە ڕەنگی شێواوم [2]
ئەگەر چی رووت و بێ مایە پەنام بۆ تۆ ئەوا هێنا
لە قاپی عیززەتی تۆمە گەلێ بێ کەسم وداماوم [3]
لە مەیدانی شەفاعەتدا دەلوورم وەك سەگی برسی
سەگی دەرگانەکەی خۆتم عیلاجێك تا نەسووتاوم
کەرێت عاسێ یە ئەی (عاصی) نەوەك عاسێ بی وریابە
نەکەی دامێنی قەت بەردەی بلێ من شێت و خەڵفاوم

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە باتی (وەرە داینێ)، نووسراوە (بفەرموو بیخە).
[2] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە باتی (ڕەنگی)، نووسراوە (حاڵی).
[3] لە دەستنووسێکی دیکەدا ، ئەم لەتە بەم جۆرە هاتووە :(لە دەرگەی غیرەتت وەستام گەلێ موحتاج و داماوم).

(٦٨)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

مەست وسەرخۆش و خەجالّەت بێ دڵ و دێوانە خۆم
دڵ لە دەست دەرچووی خەیاڵی بادەیی مەستانە خۆم
بێ شعوور و خودپەسەند و هەرزەگۆ و دونیا پەرست
لێوەشاوەی سەرزەنشتی ئەقریبا و بێگانە خۆم
گەرچە زاهیر وادەبینن دائیما مزگەوتە جێم
سینە پڕ بوغز و حەسادەت تالیبی ئەفسانە خۆم
سەد ئەسەف عومرم تەواو بوو رووم لە تەقوا قەت نەکرد
بێ زەخیرەو مایە پووچ و دڵڕەش و وێرانە خۆم
بێ دڵ و ئیدراك و سەفوەت بێ وەفا دەرحەق بەحەق
گێژو بێ فیکرو دەماغ و بێ مەی ومەیخانە خۆم
سەرفی عومرم کرد لە دونیا تۆوی چاکەم قەت نەچاند
بێ تەمای فەرمانی تاعەت ڕەنجەڕۆو بێ مایە خۆم
شەمعی بەزمارایە دڵ بوو جیفەیی دونیایی دوون
دین و دڵسووتاوی دونیا عەینی وەك پەروانە خۆم

ئـەی موسـڵمانان دەخیلـە ئێـوە وەك مـن قـەت مەكـەن
رووت و سەرگەردان و مـەحرووم وا لـەرووی جانانـە خـۆم
روو لە مـەولا كەن بەڕاستی نـەك وەكـوو مـن بەدرەوشـت
ئـەی وەكـوو تـەیری كەسـیرە بـێ نـەواو هێلانـە خـۆم
روو لە كوێ كەم روو لە كـوێ كـەم یـا ئیلاهەلعالـەمین
وا لـە بـەردەرگاهی عـەفوت روو رەش و بـێ یانـە خـۆم
دەنگـی دەققولبابـە یـارەب وا لـە قـاپی رەحمـەتت
بانگ دەكا (عاصی) مە هاتووم بێ وەفـاو پەیمانـە خـۆم

(٦٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

سەیری کەن حەق چۆن بزر بوو چەشنی بەرد کەوتۆتە گۆم
بێ رەواجە چەند لە دونیا نەقسە هەروەك نۆتی رۆم
وەك هەتیو بێ داك و بابە وێڵ و سەرگەردانە حەق
کەس نییە بیباتە لای خۆی رووت و برسی و خوارو کۆم
مەجلیسێ گەر حەق بەیان کەن هەندە مەهتووکن ئەوان
وەختی چوونە ناو عەوامان مل کەچن ئەو میسلی دۆم
بەحسی حەق فەوتاوە یاران کەس نییە یادی بکا
نا حەقیان کردۆتە فانۆس پێ کراوە شبهی مۆم
هەر دەناڵێنێ هەمیشە دەردەدارو نا ئومێد
وا دڵی فەوتا رەواجم سەد دەخیل هاوار لە خۆم
بوومە پووشی بێ رەواج و کەتمە بەر بای ناحەقی
بردمیە سەحرایی زیللەت بۆ فەنا هەروا دەڕۆم
(عاصی ) چت داوە لە عالەم حاڵی خۆت ئیسلاح بکە
حەق چ دەربەستە لە عالەم گەر هەموویان بنە ڕۆم

* * *

## (٧٠)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

لە ڕێگەی عیشقە ئیخلاسی مەحببەت شەرتە بۆ ئیمان
بە دەرسی عیلمی تەوحیدە نیزامی مەعریفەت ئاسان
دڵی خاڵی لە عیشقی حەق وەکوو مارە لە سینەتدا
بە زەهری وەك نیفاق مەعلووم هەموو جەرگت دەکا بریان
بە جادەی عیشقبازیدا بە وەسڵی حەق دەگەی جانا
ڕییا تێکەڵ بە تاعەت بێ بە شیرکی دادەنێ قورئان
خەریکی ڕێی مەحەببەت بە چرای عیشقت لە دڵدا بێ
لە تاریکی ریابازی نەجاتت گەر دەوێ قوربان
درۆیە دڵ بە بێ عیشقی بە دڵ ناوی بەری بێ مێشك
کەداری گوڵ نەبێ بۆنی دەچێتە ڕیزەیی شیلان
نەتیجەی تاعەتی بێ عیشق نیفاقە تێ بگەن یاران
هەوای عیشقی نەبێ گەر دڵ لە دەست نەفست دەبێ وێران
بینای مەردی بە نامەردی بە نامەرد دامەنێ مەرد بە
بە مەردی بێت و گەر بمری دەزانی حاڵی نامەردان

بــه زیــدی حــەق نەســووتێنی گڵــۆپی کــەهرەبای دینــت
لە جادەی حەق نەکەی لادەی ملت دەشکێ وەکــوو شــەیتان
مەحەببەت گەرنەبێ دەپسێ بە بــێ شــك وایــەری وەســڵت
لە تاریکی شەوی غەفڵــەت دەبــی حــەیران و ســەرگەردان
بــە قــووەی قونبولــەی تــەقوا بڕووخێنــە قــەڵای نەفــست
لە شــاری عاســیمەی دڵتــا نــەوەك دەرچــێ چــرای عیرفــان
موقەییەد بە لە دڵ (عاصی ) لە دەستت دەرنەچێ یەکسەر
نەوەك تووش بی لە ناکاوا نەخۆشی و عیللەتی وەك ران [1]

* * *

[1] لە قورئان دەفەرموێ (( کلا بل ران علی قلوبهم)) ( عاصی)

(٧١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

رۆژی تێکۆشـــانە ئیمـــڕۆ راپـــەڕن ئـــەی کوردەکـــان
بـــا لەدەســـتتان دەرنەچـــێتن گـــەنج و خـــاکی نیـــشتمان
ببنــە یــەك پارچــە بــە مــەردی رووحــی کێـشاون نیفــاق
پشتی یــەك بگــرن لــە مەیــدان هــەروەکوو شــێری ژیــان
چونکە یەك دڵ بوون لە گەڵ یەك پشتی یەکیان بەرنــەدا
وا بە چاو دیتان نەتیجــەی جوولــە جــوولی جوولەکــەکان
لــەم نەخۆشــخانەی نیفاقــا بەســیە نووســتن وەرنــەدەر
یەککەتی یێکــەم پزیــشکە بــێ شــرینقەو فــەحس و ژان
ئالــەت و دەرمـــانی نـــاوێ بـــێ عەمـــەلیات نـــاجیحن
شـــەربەتێکە یـــەك دڵێتـــان بـــۆ دەوای گـــشت دەردەکـــان
تەفرەقـــەش بۆخـــۆت دەبینـــی چـــەند لەسـیلیش پیـــسترە
جەرگ و گورجیلەت دەخواتن کـاکی کـوردی بـێ گومـــان
چەند هەزار ساڵە خــەریکی هــەر نیفــاق جــەرگی بــڕی
بوویـــە حیـــزو ژێـــر چـــەپۆکی بەدرەوشـــت و ناکەســـان

میللـەتێکی وا نـەفام بـێ بـۆ شـیفاش دەرمـان نـەخوا
تـا قیامـەت حـاڵی وایـە بـێ نـەواو هـەم بـێ نیـشان
دوژمنـی گـەورەی هـەمووتان هـەر نیفاقـە تـێ بگـەن
ئێـوە جـەرگی ئـەو خـراب کـەن وەك پڵنگـی چیایەکان
تـۆزە رووحێکتـان کـە مـاوە بـا ئـەویش نەڕواتـە دەر
فێری دەرسی یەککەتی بن تـاج لـە سـەرنێن وەك کـەیان
سەیری ناکەن چەندە ملوێن میللـەت و قـەومی عـەرەب
ئایەتەلکورسـی دەخـوێنن شـەو لـە ترسـی جوولـەکان
کاکی خۆم عەیبە بە قورئـان ئێـوە جووشـتان تـێ نـەبێ
نەبنـە سـاحیب نـاو لـە دنیـا نەچـنە ریـزی حوکمـەتان
هەرچـی نامـەردە دەری کـەن نیـشتمان بـا پـیس نـەکا
چـونکە زوڕناچـی بەلاشـن بـۆ هـەموو بێگانـەکان
دیـن هـەوێنی ئیتتیفاقـە ئـەو قـسەشتان پـێ بڵـێم
دینـی ئیـسلام بـۆ سـیلاحی پـێش رەوی ئیـسلامەکان
بەسییە (عاصی) واز بهێنە چیکە خـۆت مانـدوو مەکـە
تەفرەقـە وا گـوێی بڕیـون بوونـە عەبـدی عەبـدەکان

* * *

## (٧٢)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

**لە گەڵ مەئمووری ئەوقافی کۆیە نیزاعێکمان هەبوو .**
**حیکمەت زەهاوی قائیمقام بوو ،**
**عەریزەم تەقدیم کرد بۆ حەل کردنی ،**
**لە دوای چەند وەختێك مەئموور بەدرۆ ئیقناعی کرد .**
**منیش ئەو شیعرانەم بۆ نارد لە ١٣ / ٣/ ١٩٤٠**

عەریزەم ناردە خدمەت بەگ لە تاوی دەردی بێ دەرمان
لە بۆ نوسخەی تەداوی دڵ ئەوم دانا وەکوو لوقمان
گوتم ئەی دڵ لە تۆ مژدە ئەوا تووشی تەبیبێك بووی
عیلاجی تۆی لە لاسەهلە فریبم دا بە چەند بورهان
سەرەو ژێر بوو گوڵی بەختم بەقاناکەم بکا تەئسیر
لە سووئی تالعم سەهلە بڕووخێ گەر هەموو ئاسمان
گرەومان کردو دڵ فەرمووی نەتیجەی پێت بڵێم چۆنە
بە فلسێ نایکڕن شیعرت ئیتر وازبێنە بێ ویجدان
زەکاووجەوهەرو عەقڵت هەمووی پەشمە بەهاناکەن
دەبینم هەرچی زانایە هەمووی کەوتۆتە ناو کۆڵان

تەماشای حاڵی خـۆت ناکـەی ڕەواجـی نەقـدی ئەشـعارت
لە بازاڕی قبووڵ کـردن عومـوومی قەڵپـە نـەك نوقـسان
ئەوانـەی تـۆ کـە نووسـیبوت ڕەواجیـان یـەك درۆ بـردی
سکەی شیعرت شکا یەکسەر لە مولك و مەنتیقەی کوردان
بە دیققەت گوێ ئەگەر بگری لە ناڵەی شـیعرەکانی خـۆت
ئـە گریـەی تـاکو مـاوی تـۆ لـە ئیـشی گەردشـی دەوران
کە شیعری تۆ لە هیچ جێگا بە پووڵێ نـایکڕن ، (عـاصـی)
هــەوایی شـاعیری دانــێ وەکــوو وەحــشی بـچۆ هــەردان

* * *

## (٧٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

**بۆخزمەت جەمیل ئاغا.**
**وەختێك پۆلیس دەهاتنە بازاڕ**
**بەر دوکانەکانیان بە عالەم دەماڵی .**
**رۆژێك پۆلیسێك خۆی تووڕە کردو وتی :**
**ئەتبەم بۆ سەرا ، منیش ئەوەم نووسی**

ئاغە توخـودا لوتـف فـەرموو تۆلـەرێی حـەیبی مـەنان
دەفعەیـەك بـۆ سـەیری عالـەم بێـرە بـازاڕ ئەلئـەمان
حـاڵی عالـەم زۆر خراپـە وا لەدەسـت جـەورو سـتەم
پـاك جگـەرمان بۆتـە زووخـاڵ ناڵەناڵـەی کاسـبان
دووکـەڵی ئـاهی فـەقیران گـەر فەلـەك بیگرێتـە خـۆی
نـووری رۆژی وا دەفـەوتێ رەش دەبـێ سـەتحەی جیهـان
وا عەمامەی ئـەهلی عـیلم و ریـشی سـەبید هـەردەمێ
بوونـە گێـسك وا لـەبازاڕ پـیس بـوون هـەردووکیان
وەختی چێـشتەنگاو هەمیـشە دێنـە خـوارێ بیلعومـووم
سەر لە ئەرزو دەست بە لـەرزو قـون تلـوور پیرو جـەوان

وا لیباسمان پاکی فەوتا هەندە فلّچەی لێ بدەین
بۆتە جێ زبڵی حەمامچی سەرکەشیدەی حاجیان
حەیفە بۆ ئەهلی کەسابەت ببنە جێگای زۆر و غەم
یا خو مەحکووم بن بە ناکەس ئەهلی عیلم و خانەدان
وەختی پۆلیس دێنە بازارِ لافی زابت لێ ئەدەن[1]
کەس نییە لێوی هەڵێنێ غەیری فەرموو، بێ گومان
بە عزەکیان قەرزاری بەندە وەختی گەینە راستی من
ئەمری شیددەت زۆر دەکەن لێم دێمەخوارێ دەرزەمان[2]
پێم دەڵێن گەر زوونەکەی حازر بە جەبرەن بۆ جەزا
من لە تاوی فەقری حاڵم دێمە لەرزو خەستەجان[3]
دەیکەمە تۆزو غوبارو پێم دەڵێن هێواش مەلا
چت نەهێشت دووکانی عالەم رزقەکەت کردین نیهان
ئینتیزارم بۆ جەنابت مەرحەمەت کەی دەرحەقم
ئەهل و میللەت زۆر رەزیلن وا بە ئەمری ناکەسان
من دەڵێم مادام وەهایە قەرزی (عاصی) با نەخۆن
لوتفی تۆشی با لەگەڵ بێ نەچمە ریزی موفلیسان

❊ ❊ ❊

---

١) لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە ( لێ دەدەن ).
(٢-٣) لەدەستنووسێکی دیکەدا ئەوەی هێڵی لەژێر کێشراوە، لەم دوودێڕەدا جێگۆرکێیان پێکراوە.

(٧٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

وان لە گێژی بەحری جەهلا وەرنە دەر ئەی گەنجەکان
عیلمە پاپۆڕی نەجاتتان تێ بکۆشن رۆڵە گیان
نەك لە رێبازی ژیانا تووشی کۆسپەی غەم ببن
عیلمە لەنگەر بۆ سەفینەت هەم قەڵاتە بۆ ژیان
عیلمە ئەتخاتە هەواوو چەندە چوستە سەیری کەن
چۆن بەیەك لەحزەت ئەباتە عاسیمەی بێگانەکان
عیلمە زێڕو عەقڵە تیزاب جەوهەرت باش دەردەخا
چونکە میقرۆبە عەزیزم ناوی بێ عەقڵی و نەزان
خۆت بە سەرخە تۆ بە عیلم و باش بەڕێی عەقلا بڕۆ
هەربە ئەو دوانەش بە دەرکەوت حیکمەتی لوقمانەکان
رۆڵە بێ عەقڵی بە پارە قەت نەکەی بکڕی ئەتۆ
تا لەژێر بەیداغی عیلما باش بژی ئەی نەوجەوان
هەر لە سەر کورسی شەرەف بە عیلم و عەقڵت مایە بێ
نەك بەبێ عەقڵی بکەویە قوژبن و کۆلانەکان

گەر لـەرێی تـاریکی جـەهلا تـۆ چـرای عیلمـت هـەبێ
عــەقڵی کامــل پــاتری بــێ دەچــیە ریــزی گــەورەکان
تۆ شعوورت گەر تـەواو بـێ بـاش تەماشـا کـە بـە چـاو
وا لــە بەرچــاوتە بــە قوربــان واریــداتی عیلمــەکان
فورســەتە زووتــێ بکۆشــن بــا لــە دەســتان دەرنەچــێ
ببنــە لۆمــەی لۆمــەکاران یانــە بــەدناوی جیهــان
عیلم و عەقڵت هەردو هیچە گەر ئیتاعـەی خـوا نەکـەی
کوێری دەشتی مەحشەری تـۆ تـێ بگـە ئـەی نەوجـەوان
غەیری چاکە و هەم سـەلاحت سـوودی نـابێ چـاوی مـن
دەخەنــە زنــدانی ئــاگر بــێ کــەس و بــێ پــشتیوان
گــەر بــە دڵتــانیش نــەبیتن لــێم ببــورن کــاکی مــن
مــن شــعوورم هەروەهایــە چــونکە (عاصــی)م لاوەکــان

* * *

(٧٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

# مەرسییەی نافز جەلال
# وەزیری زەراعە

شێری نـاو بێـشەی شـەجاعەت خۆشەویـستی کوردەکـان
ئـەی گـوڵی بـاغی شـیمالی پـیر عـەقل ونەوجـەوان
شێری جەوهـەرداری قـەزبێن پێـشڕەوی مەیـدانی جـەنگ
چاونەترسی چنگ بـە خوێنمـان ئـەی پڵنگـی چیایەکان
مەرکـەزی عەهـدو وەفامـان دەرحـەقی قـەوم و وەتـەن
بۆچی کۆچت کـرد لـە ناومـان نـەو نـەمامی خانـەدان
ئـەم سرشـت و ئیزدیحامـە هیممـەتی بەرزانییـە
ئـەی ئومێـدی کـوردی سـۆران مەئمـەنی بـەرزانیان
رووکە مەجلیس سەیری چاویان پڕ لە فرمێسکە لە بـۆت
هاورەفیقانـت ببینـە عـاجزو دڵ پـڕ لـە ژان

بۆ دەروونـی قـەومی کۆیـە تـیری حەسـرەت کەوتـە کـار
داخـی جـەرگی تـاکو مـردن هـەر بەئێـشە بـێ وچـان
خوات لەگـەڵ بـێ کاکـە نـافیز چاری قـودرەت نـاکرێ
ڕۆژی دیدارت بـە قوربـان کەوتـە قیامـەت بـێ گومـان
تۆ سەلامەت بوی کە دەرچووی خۆ لـە نـاو داروسسەلام
چت بە سەر هـات هـەردو چـاوم وا لـەدێی داروئـەمان
بـوو بـە دارولفتنـە بـۆ تـۆ سـەد ئەسـەف وا حەسرەتا
نووکی شمشیری ئەجەل بوو یـەك نەفـەس نەیـدای ئـەمان
بولبـولی خۆشـخوانی رووحـت چـاوەکەم بۆکـوێ فـڕی
تیری قودرەت جەرگی شەق کرد داخی جـەرگم کاکـەگیان
شـەوقی دیـوانی وەزارەت مەسـدەری حـیلم و شـەرەف
میهرەبـان و خـۆش تەبیعـەت خوسـرەوی شـیرین زبـان
فـەخرە بـۆ مێـژوویی کـوردی باسـی چـاکەو غیرەتـت
میحنـەتی تەئریخـە ئـەمما کۆچـی ناوەعـدەت لـە ژیـان
عالـەمی کـوردی عیراقـی دیـدە گریانـە لـە بـۆت
ناوی تـۆ نەقـشە لـە دڵیـان چەشـنی تـورڕەی شـایەکان
یەك نەفـەس چـاوت هەڵێنـە سـەیری رەسمـی تەعزیـەت
چەند بە ناسـۆرە لـە تـاوت قـەومی کـورد پـیرو جـەوان

شۆڕشی خـستۆته نـاو کـورد ئـەم پـەژارەی مـەرگی تـۆ
دوور و نیزیـک زۆر بـە داخـن ئـەقریبا و بیگانـەکان
بوو بە چل رۆژ کۆچـی دواییت تـێ بفکـرە کـاکی خـۆم
هاو جەلیـست بوونـە میـوان هەسـتە وەك شـێری ژیـان
دەم بە خەندە رووکە مـەجلیس بـۆ دوعـا خـوازی لـەوان
هـەم لـە ئـەهلی کۆیـە گـشتی هـاورەفیق و خزمـەکان
ویغفـرالله[1] دەنووسـم دەرحـەقی تـاریخی تـۆ
خـوا رەحیمـە لیت ببـووری بـچییە نـاو بـاغی جینـان
(عـاصی) تـا مـابێ عـەزیزم تـۆی لـە بـیرەو هـەردەڵێ
لیـی ببـووری یـا ئیلاهـی لـەم شـەهیدەی نەوجـەوان

١٨ تەمووزی ١٩٧٢

* * *

١-( ویغفرالله) بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە (١٣٩٢) کە میژووی کۆچ کردنەکەیە.

(٧٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

## مەرسییەی مەلا ئەمین شکاك
## ١٣٩٥

بیست و حەفتەم مانگی ڕۆژوو کەوتە گریە ئاسمان
بۆ مەلامین هاتە جونبوش چەرخەکانی دوودمان
ئەو نموونەو جەوهەرێك بوو بۆ هەموو کوردی شیمال
حەسرەتا تیغی ئەجەل هات لەحزەیەك نەیدا ئەمان
شێری ناوبێشەی دیانەت پەیڕەوی شەرعی شەریف
تابیعی ڕێگەی هیدایەت هەم ئەمینی نیشتمان
سەد ئەسەف دەرچوو لە دەستمان مەخزەنی حیلم و شەرەف
یەعنی خەتتاتی لەتیف و نیك خولق و عالی شان
یەك هەزار و نۆسەد و حەفتاوو چواری زایینی
کۆچی دوایی کرد لەدنیا ئیستیقالەی کرد لە ژیان
ئەو لەبیب وخولق خۆشە خوای لەگەڵ بێ تێپەڕی
داخەکەم بۆ ئەو نموونە چوو لە کیسی کوردەکان

سوئالم کرد له فیکری خۆم له بۆ تەئریخەکەی هیجرەت [1]
(بـالغنی الکـریم )[2] بـاش بـه ئەبجـەد بـوو بـەیان
وا لەخوای داوایـە (عاصـی) لێـی ببـورێ گـشت گونـاه
بیبەنـە خولـدی بـەرین وپێـی بلـێن جەننـەت مـەکان

❊ ❊ ❊

## ئەوەش بۆ کێلەکانی مەلا ئەمین شکاك

بیـــست و حەفتـــەمینی مـــانگی رەمـــەزان
مـــەلامین ئیـــستیقالەی کـــرد لـــە ژیـــان
گـــەر لـــە تـــاریخی دەپرســـی تـــێ بگـــە
(بـــالغنی الکـــریم ) بـــە ئەبجـــەد بووبـــەیان
خـــودا لێـــی خـــۆش ببـــێتن لـــەو ئەمینـــە
پێـــی بلـــێن خەتتاتـــەیی جەننـــەت مـــەکان

❊ ❊ ❊

[1] ئەم لەتە کێشەکەی جیایە. ئەمەهەزەجی هەشتی تەواوە: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
[2] (بالغنی الکریم) بەحیسابی ئەبجەد دەکاتە(١٣٩٤).

## (٧٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

## بە موناسەبەتی رۆژی (١١) ی ئەیلوول
## کە دەستیان بە (ثورة ) کرد و
## ئاگریان لە چیایەکان کردەوە . بۆ تێگەیشتن

رۆژی یازدەی مانگی ئەیلول بـوو بـە جێژنـەی کوردەکـان
ئـاگری شـۆڕش هەڵایـسا شـەوقی دایـە رووی جیهـان
وا لەدیار ئەم جێژنە سەیری هـەروەکوو غیلمـان و حـوور
سـەف بـە سـەف وەسـتاوە تیپـی لوئلوئـو مەرجانـەکان
چەند بەڕێزن ڕیز بـە ڕیـزن وەك گـوڵ وغونـچەن هـەموو
ڕەنگـی ئـاڵ و بـۆنی خـۆش و بولبـولێکن نەغمـەخوان
پیـاوی چـابن ببنەیـەك دڵ پـشتی یـەکتر بەرمـەدەن
واریـــداتی خـــاکی خۆتـــان مەیدەنـــە بێگانـــەکان
فیلحەقیقـەت ئێـوە شێرن سـەد ئەسـەف ڕێـوی نیفـاق
گـشتی واکردنـە ئەسـیرو بـێ شـعوورو هـیچ نـەزان

زۆر بــه مەردانــه عــەزیزم خــاکی خۆتــان پــاس بکــەن

بــچنه مەیــدانی نەبــەردی وەك پڵــنگ و شــێرەکان

گەر شیعارتان یەککەتی بێ ئــەهلی مێـژوو فەخرەکـەن

سەیری کـەن بەیـداغی ئێـوە وا لــە لوتکـەی چـیایەکان

رایـــدەژێنێ لـــەو بڵنـــدە بـــای زەفـــەرتان دائیمـــا

نـــاوی خۆتـــان زوو بەدەرخـــەن تـــازە لاووگەنجـــەکان

پـــرچ و بـــسکی تازەعـــادەت هەیبـــەتی ئێـــوەی نەهێـــشت

ئۆتوماتیکتـــان لـــە دەســـت بـــێ روو بـــەرووی بێگانـــەکان

رەســـمی شـــیرو خەنجـــەرو تـــۆپ و تفـــەنگتان بـــا هـــەبێ

ببنـــە شـــێر و نرکـــەتان بـــێ وەك پڵـــنگ بـــن رۆڵـــە گیـــان

دۆشکەیەك پەیدا کـــە دۆشـــەك کـــەڵگی ئیمـــڕۆی نـــاگرێ

هەروەکوو دووپـــشکە رەشـــکە راکـــە ســـەر دەببابـــەکان [1]

خـــۆت بکـــە بـــازو شـــەهێن و دوژمنـــت لاکێـــشکەبێ

گورج بـــە گورچـــیلەی دەرێنـــە بیکـــە عیـــبرەت بـــۆ زەمـــان

لـــەم نەخۆشـــخانەی نیفاقـــا بەســـیە نووســـتن وەرنـــە دەر

یەککەتی بێکـــەم پزیـــشکە بـــێ شـــرینقەو فـــەحس و ژان

---

[1] لە پەراوێزدا نووسراوە :( بۆ دژی جەو تێبکۆشە رووی بکە باڵندەکان) .

ئالــەت و دەرمــانی نــاویٚ بــیٚ شــکە گــەر نــاجیحن
شــەربەتیٚکە یــەك دلّیتــان بــۆ دەوای گــشت دەردەکــان
تەفرەقــەش بــۆ خــۆت دەزانــی چــەند لەسـیلیش پیـسترە
جەرگ و گورچیلەت دەخواتن کـاکی کـوردی بـیٚ گومـان
تــۆ کــە نــاوت هاتــە نــاو نــاو غیرەتــی بەرزانییــە
تۆش وەکــوو شــیٚرانی بــەرزان روو بکــە رووی جەبهــەکان
چەند هەزار ساڵە خـەریکن هـەر نیفـاق جـەرگی بـڕین
بوونە عەبدو ژێـر چـەپۆکەی بـەد رەوەشـت و ناکەسـان
تــۆزە رووحیٚکتــان کــە مــاوە بــا ئــەویش نەڕواتــە دەر
فیٚـری دەرسـی یەکـدڵی بـن دەبنـە سـەردار وەك کـەیان
هەرچــی نامــەردە دەری کــەن نیــشتمان بــا پــیس نــەبیٚ
چــونکە زۆڕناچــی بەلاشــن بــۆ هــەموو بیٚگانــەکان
چونکە یەکدڵ بوون لە گەڵ یەك پشتی یـەکیان بەرنـەدا
وا بە چاو دیتان نەتیجـەی جوولـە جـوولی جوولەکـەکان
دیــن هــەوێنی ئیتتیفاقــە ئــەو قــسەشتان پــیٚ بلّــیٚم
دینــی ئیــسلام بــۆ ســەلاحی پیٚــشڕەوی ئیــسلامەکان
کــاکی کــوردی زۆر بــە دیققــەت ئــەم قــسانە وەرگــرن
رووکەنــە دەرگــاهی مــەولا زۆر بــە دڵ ئــەی لاوەکــان

قەت هـەوێن نـابی هیواتـان بـێ شـیعاری دینـی حـەق
هـەر شـکاوو تـێ شـکاون مەچـنە دوای شـەیتانەکان
پشت بەخوا بەستن بەڕاسـتی دەبنـە سـەرکەوتوو هـەموو
گـەر خوداتـان یاریکـار بـێ دەبنـە شـابازی جیهـان
خوا پەرست بن گەر بەراسـتی خوارو پەسـت نـابن ئەبـەد
دەبنـە رۆسـتەم بـۆ شـەجاعەت دەچـنە نـاو تەئریخـەکان
گوێ لە فیکری چونکە ناکەن وەختە (عاصی) شێت ببـێ
دوای نەمانی قورِ دەپێـون چـوو لـە دەستمان پەنـدەکان
چیت لە بسك وپرچی لوولە ، لوولـە تۆپـت وا لـە پـێش
رووی لـە کەللـە وناوچـەوانتە نەوجـەوانی کەللـە پـان
تۆ لە باتی رشـك و ئەسـپێی بـسك و پرچـت لاوی کـورد
ئەسـپ و رەشـشاشێ پـەیا کـە بـۆ نـەجاتی نیـشتمان
دەفعـەییێکی زۆر بـە دیققـەت سـەیری ئاوێنـەی بکـە
خۆت بە چـاوی خـۆت دەبینـی چـوویە شـێوەی کیـژەکان

*　*　*

(٧٨)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

## وەختی بۆردومان کردنی شیمال
## بە تۆپ و تەیارە و دەبابە
## لە خوا پاڕامەوە چاکی بکا

گرمــــەگرمی تـــۆپ وســـاروخ شـــیوەنی منـــداڵ و ژن
کوڕ دەڵـێ ئـەی دایـە هـاوار ، داك دەڵـێ هـاوار لـەمن
دەنگـــی پەروانـــەی تـــەیارەو قرچەقرچـــی دۆشـــکەکان
هــیچ پــەناو پێــچی نــەماوە بــچنە کــوێ تــا دەربــچن
زیــڕە زیــڕی چــەرخی دەببابــەش لــە ســەر خــاکی وەتــەن
روولە کوێ کەین یا ئیلاهی دێتە دوامان کـون بـە کـون
قونبولــە و تیــزاب و بۆمبــا جــەرگی ســووتاندین خــودا
قــەت پــەناو قــۆژبن نــەماوە لوتــف و ڕەحمــی تــۆ نــەبن
بــا لــە فرمێــسکی هــەتیوان هەڵخلیــسکێ ئــەی خــودا
مەنگەنەو هەم تۆپ و تایەی لەت لەت و سەد پارچە بـن

یا هەناسـەی ساردی ئـاهی روولـە رووی منـداڵ کـوژاو
بـاڵ و پەروانـەی بـسووتیٚ میٚکـەکان بـا دەرنەچـن
ئیٚمـە منـداڵین خودایـە بـیٚ گونـاه و بـیٚ پـەناین
قـووت و قووەتمـان نـەماوە ئـەی خوداوەنـدی مـەزن
ئیٚمە وەك قسمی فەقیرین چەشـنی گـەنم و جـۆی فـەریك
بووینـە قـاوەڵتی کلـۆو و کیـسەڵە و خـۆراکی سـن
مژدە بیٚ ئەی کاکی (عاصی ) ئاهی مەزلووم کەوتـەکار
خۆی و تەییارەی کـە سـووتا و خانمـە فەنـدیش بیٚـوەژن .

*　　*　　*

## (٧٩)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان
(هەزەجی هەشتی موسەببەغ)

هەوام بالاتره ئیمڕۆ لە چەرخی عەقرەب و پەروین
سەفام ڕووناکترە قوربان لە قەلبی زاهیدی خودبین [1]
بەخزمەتکاری ڕاناگرم نەکەیکاوس نەکەیقوبباد
غولامێکم ئەوا کەوتووم لە دەرگەی شێخ عەلائەددین
بە عەبدی ناکرم ئیمڕۆ ئەمن تەیموور و بەهمەن شا
بە ڕێوی ناکرم شێرو بە عەنقا نامەوێ شاهین
بەشوانی نامەوێ یاران دوسەد شازادەیی سالار [2]
بە گاوانی چە عەد ناکەم نەوەك ڕۆستەم نەوەك ڕووبین
بە جوتیاری حیساب ناکەم بە هیچ دەم شاهی ئەفراسیاب
بەقاترچیشی نازانم هەموو شازادەکانی چین
گەدای دەرگانەمە قوربان لەخوانی جوودی من حاتەم
بیحەمدیللا کە مەعدوودم بە مەنسووبی عەلائەددین
بە وەرزێر نامەوێ فەرهاد کە بێستوونی لە عیشقا کەند
بە مووری نامەوێ خوسرەو بە جارییە ناکرم شیرین
منی (عاصی ) لە گەڵ شێرا هەمیشە پەنجە بازیمە
کە دەستم گەییە دامێنی سەفابەخشی دڵی غەمگین

* * *

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە باتی (زاهدی )، نووسراوە (عابدی ).
[2] لە دەستنووسێکی دیدا لە باتی ( سالار )، نووسراوە (تەهران).

(٨٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

## ئەم شیعرانە جەوابی دووبرای خۆشەویستە لە کەرکوکەوە نامەیان بۆناردبووم :
## تەها و عابدین

مەرحەبا ئەهلەن وە سەهلەن یا ئەخینەلعابدین [(١)]
نامەتان زوو گەییە دەستم ئەی برای دونیاوو دین
وەك کە قاسید دایە دەستم نامەکەی ئێوە گوتی
تحفة الاحباب هذا ینتج حب المتین [(٢)]
قد فهمت محتواها حینما طالعته [(٣)]
گەوهەرێکی ناو سەدەف بوو لەعل و مەرجانی سەمین
نور قلب الحزین ضوء مصباح السرور
وەك کە دیتم ناوی ئێوە وا بە ئیخلاس و یەقین

---

١ - راستییەکەی: (یا أخانا العابدین).
[٢]راستییەکەی: (الحب المتین) .
[٣] راستییەکەی: (طالعتها) .

نامـــــەرا چـــــون برگـــــرفتم حالـــــت دلتنگـــــیم
هەروەکوو وەحییـــی ســـەمابوو کەوتمـــە رەقـــس و پێکـــەنین
دڵ بـــــەیادی ئێـــــوە دائـــــیم پـــــڕ ســـــروورو شـــــادییە
بۆتـــــە ویـــــردی ســـــەرزبانم زیکـــــری تاهـــــا و عابیـــــدین
وەختی گەیمە دەرکی غورفەت پـێم بڵـێ ( عاصـی ) وەرە
(( هـــذە جنـــات عـــدن فادخلوهـــا خالـــدین ))

❊ ❊ ❊

## (٨١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

قەومی کوردی گوێ لە من کەن زۆربە فیکرێکی تەواو
گەینە ئامانجی هیواتان پاشی سەد ساڵی تەواو
میوەیی سەبرو سەباتتان خوارد لە باغی کۆششا
ئافەرین سەربازی کوردی بازو شمقارڕ هاتنەراو
پشت دەنە یەکتر دەخیلە فورسەتە ئەی لاوەکان
بینە شێری چنگ بە خوێن و وەك پڵنگیش وەرنە راو
وا لە تاریکی پەژارەی نەکبەتی شەڕ قەومی کورد
سەیری ساحەی نیشتمانتان حەمدولیللا بووە هەتاو
چەپڵە لێدەن کاکی کوردی هەربڵێن ( یحیا العرب )
ئەی عەرەب ئێوەش بفەرموون ( هەر بژی کوردی ) بەناو
یازدەمینی مانگی ئازار وا تەواو بوو تێ بگە
کاتێ ئیمزای بەندەکانمان بینە بەرمەیدانی چاو
روو کە ناو دەریای سەداقەت خۆت زەریف بسمیل بکە
نییەتی دڵ پاکی بێنە کاتی عوزرت بوو تەواو

گــورگی فتنــه ورگــی بــدڕن پێکــەوە کــوردو عــەرەب
بیکەنــە دەعــوەت لــە بــۆ ســەگ وەك بــەرازی زگ دڕاو
پیاوی چـابن پیـاوی بـەدگۆ گـووی لـەدەم کـەن هـەردولا
گــوێی و لــووتی هــەردو بــبڕن رووی کەنــە زوورگــەزراو
حەمدوولیللا بەختی کـوردی رووی لـە بـەرزایی کـە کـرد
نوختــەییێکی جەوهــەری هــات نــاوی دەرخــستووە تــەواو
ئەی چەقەڵ تۆڕاکە ناوچـەم چـنگ لـە چـنگی شـێرمەدە
چونکە کەللەت زوو دەهــاڕێ دەبییــە عیــبرەت بــێ هــەناو
دەست دە دووربین زۆر بە دیققەت سەیری جێگای کورد بکە
هــەر پــەنا بــەردێك پڵنگێــك تــازە وا هاتۆتــە راو
ئــەو وەکــوو هــەوری بــەهاری دێتــە نرکــە رووبــەرووت
چت لە دەســت دێ هــەردو چـاوم بـەو عــەباو سۆڵی دڕاو
چــاوەنۆڕی لــوتفی ئێــوە (عاصــی) عــەرزی تۆدەکــا
با خــەلاس بــێ بــوغزو کینــە باســی کــوردیش بێتــە نــاو

۱۹۷٤/٤/۲، ۹ ی ربیع الاول ی ۱۳۹٤، ۱۹ ی ئازاری رۆمی ۱۳۸۹

❊ ❊ ❊

## (٨٢)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

قەومی کوردی روو لە خوا کەن پیرو گەنج و تازەلاو [١]
هاتەدی ئاواتی دڵتان پاشی نۆ ساڵی تەواو [٢]
پیاوی چا بن روو لەدین کەن خوای لە خۆ رازی بکەن
دین و دونیاتان دەبێتن پایەدارو بەرز ناو
بینە یەك پارچە دەخیلە تەرکی کەن ئەم تەفرەقە
گەر هەمووتان یەکدگیربن هێزی دینیش بێتە ناو
کێ هەیە بۆت بێتە مەیدان خۆی لەبەر تۆ راگرێ
دەست بەجێ رووحی نەکێشن نەیکەنە پۆڕی خوراو
گەر خوداتان پشتیوان بێ روولە رووی دوژمن بکەن
غیرەتی شێرانی کوردی عالەمیش دیتی بە چاو
بێنە بەرچاو حاڵی پێشووت چەند هەزارساڵە ئەتۆ
هەر ئەسیری ئەجنەبی بووی رووت و قووت و بەش خوار

---

[١] دیارە بەبۆنەی رێککەوتننامەی (١١) ی ئازارەوە نووسیویەتی.
[٢] لە پەراوێزدا نووسیویەتی: ( مەیخەنە پشت گوێ عەزیزم بیکەنە سوڵحی تەواو ).

(٨٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

# بۆ ئامۆژگاری

بە سیە ئەی کوردی بەغیرەت ببنە یەك دڵ دەبنە پیاو
رووکەنە ئادابی دینی شێری مەست بن رۆژی راو
وەك لە سەر کێوی شیمالا رۆژی ئاواتت هەڵات
شەمشەکوێرە بزر بوو زوو لە بەر تاوی هەتاو
تێبفکرن ئێوە ئیمڕۆ چۆن سەرۆکێکتان هەیە
ناوی بەرزانی دەلیلە یەککەمین بازە لە راو
خادیمی دینی موبینە پێشڕەوێکە حەقپەرست
چونکە ناوی مستەفایە چەندە بەرزو لێوەشاو
بازی خۆشپەروازی کوردبن بێ فەرق گەورەو بچووك
کوندە بۆی بەدگۆ لەناوتان بیخەنە زندان و داو
ئەسلیحەی دینتان زیاد کەن دەچنە سەرکورسی شەرەف
سەنگەریشتان ئیتتیفاق بێ و زۆر بە مەردی بچنە ناو
هێزی ئێمە هەر بەدینە روکەنە فەرمانی خوا
قەت نەکەن پشتان لە دین کەن تاکو نەبنە پشت شکاو

بـــێ مبـــالاتی بــــە دینــــە کەوتنــــە دوای بێگانـــەکان
لێ دەدەن زورنـــای بەلاشـــی بـــەو دەمـــاغی ناتـــەواو
دیــن چــرای رێگــای نەجاتــە تــۆش بــەدوای نــەفس و هــەوا
گــەر بکەویــە شــوێن ئەوانــە مایــە پووچــی بــەش بــڕاو
لێــوە شــاوەی ئــەو عەزابــەین چــونکە پــشتمان کــردە دیــن
زەهــری نـــاکۆکیش بـــە جـــارێ بۆگـــەنی کـــردووە هـــەناو
ســـەد دەخیـــل وریـــا بـــە دینـــت بـــا لـــە دەســـتت دەرنەچـــێ
نـــەفس و شـــەیتان وا لـــە دووتـــن چەشـــنی توولـــەی فێـــرەڕاو
حوکمی قورئانتان بەجێ هێشت کەوتنەشوێن قانوونی شووم[1]
قوڕ بەســـەر عـــەقڵی نـــەفامتان بوونـــە قـــەومی بـــاش نـــەماو
پیـــاوی چـــابن ئێمـــە کـــوردین خـــادیمی دینـــی مـــوبین
رروکەنـــە ئـــەحکامی شـــەرعی نـــا بنـــە ئیـــسلام هـــەر بـــەناو
ســـەد ئەســـەف بـــۆ ئێـــوە یـــاران زەنبەلـــەی دینتـــان پـــساند
کاتـــژمێری دڵ بـــە جـــارێ کەوتـــە دەســـت شـــەیتان تـــەواو
بوونـــە چـــەند حزبـــی نـــەفام و دوژمنـــی یـــەکتر هـــەموو
تـــەرکی نوێـــژو تـــەرکی رۆژوو وا لـــە ناوتـــان بۆتـــە بـــاو

[1] لە ژێر: ( حوکمی قورئانتان بە جێهێشت )، نووسراوە: ( رووکەنە ئادابی شەرعی ) .

بەو خودایـەی بـێ شـەریکە و تـۆی پـەیا کـردووە لـە هـیچ
تـاکوو دەمـرن گـەورە نـابن تاوەهـابن نابنـە پیـاو
فیکـری نـاکۆکی فـڕێ دەن ببنـە یـەك پارچـەی مـەتین
زوو لـە نـاو چـاڵی جەهالـەت وەرنـە دەر وەك شـێر بـەتاو
رێك وپێك بن گەر لە گەڵ یـەك تـەختی جەمـشیدتان هەیـە
تـاجی کـەیکاوس لـە سـەر کـەن چەشـنی قـەڵغان و کـەڵاو
دەبنـە خەسـرەو یـەك بـە یـەکتان نیـشتمانتان شـیرنە
مێشکی ورد کەن چەشنی فەرهاد هـەر کەسـێکی بێتـە نـاو
کێـوی ئـەلبورزن بـە غـیرەت ئێـوە بـۆ کـەس نانـەون
داخەکـەم دیلـی نیفـاقن سـووك وپـووك و پـەت کـراو
دەسـتی مـن دامێنـی ئێـوە بەسـیەتی هۆشـتان هـەبێ
واز لـە نـاڕێکی بهێـنن ببنـە قـەومێکی بـەناو
ئـەمریکاو ئینگلیـز و یۆنـان هـەم فەرەنـساو رووسـیا
دوژمنـی دیـن و وەتـەنن ئـەی خـەواڵووی هـۆش نـەماو
عەیبـە بـۆ بێگانـە دائـیم بوونـە چـاوەش کوردەکـان
روو لـە شـەرعی مـستەفا کـەن گـەر گەرەکتـە ببنـە پیـاو
چـونکە بـێ مایـەن لـە نەقـدی ئیتتیفـاق ئـەی چـاوی مـن
دائیمـا بـێ سـام و شـەوکەت مایـە پـووچ و تـێ شـکاو
مەسئەلەی رێکی و نیفاقتان بێننـە پـێش چـاو ، تـێ بگـەن

قــەت وەکــوو ئــێکن لــە لــەززەت چێــشتی ترخێنــە و پــەلاو
چــاکە باشــتر بــۆت بــەیان کــەم تــاکو باشــتر تــێ بگــەی
فــەرقی بــەفراو چــەندە زۆرە ئــەو لــە گــەڵ ئــاوی گــەڕاو
بەســتە ئــەم پەنــدە عــەزیزم فیکــری لێ بکــەن زۆر بــەدڵ
گــەر شــعوورتان تێــك نەچــوو بــێ دەبنــە شــێری تــازە ســاو
نــاوی ئێــوەش وەك ســکەندەر هــەر دەمێنــێ تــا ئەبــەد
هــەم لــە پــێش یــەئجووجی ناحــەز دەبنــە ســەددی دارڕژاو
هێــزی دینتــان گــەر لــە گــەڵ بــێ دەبنــە یەککــەم نامــەوەر
هــەروەکوو شــاهی فەرەیــدوون دەبنــە ســاحیب تــەخت و نــاو
وا چــەنەم شــل بــوو لــە گــەڵتان داخەکــەم ســوودی نــەبوو
بــێ دەمــاغی بۆتــە دەســتوور لێــك بــە داخــن دڵ بــەتاو
حــاڵی ئێــوە مــن دەبیــنم چــت بەســەردێ کــاکی کــورد
لێــدە تــەپڵی بــەد رەوشــتی تــاکو دەمــری نابیــە پیــاو
(عاصی) هەر هێندەی لە دەست دێ دەرسی راستان پێ بڵێ
پیــاوی بــاش بــن تــێ بکۆشــن عەیبــە ســستی و خاوەخــاو

* * *

(٨٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

سەیری بـازی فیکـری مـن کـەن بـۆ وەتـەن چـۆن هاتـە نـاو
کونـــدەبۆی هاتۆتـــە نـــاوێ ئیمـــڕۆ بۆیـــە هاتـــە راو
کاکی عارەب خۆت و (شت گول) خوات لە گەڵ بێ بۆ جنـوب
چونکە (خۆش حەچی) لـە نـاو کـورد چـاوەکەم نـابێ بـەباو
ئێمـە کـوردین و بـە کوردیـت پـێ دەڵـێین هەسـتە بـڕۆ
کەر قورِو بار سـووك بـە یـا بـە فـەرموو زوو دەرچـوو لـەناو
دیـار بـە دیـاری نـەوتی کـەرکووك هیـچیتر چـاو چـرمەکە
یـەك دو گـاڵۆن ئیزنـە پڕکـەن بیکەنـە دەرمـانی چـاو
کـەر دەزانـێ شـاری کـەرکوك خـاکی کوردسـتانە تـۆش
تـا دەگەیتـە چـۆلی قورفـە قـەت نەکـەی ئـاوڕ بـدەی
سـواری سـەییارەی سـەریع بـن لێخـوڕن یـەکجار بـەتاو
هـەر لـە خـاکی تورکیـاوە تـا نیهایـەی خانـەقین
گـشتی هێلانـەی پڵنگـە فەرخـەکانمان وا لـە ڕاو
شـەوقی ڕۆژی غیرەتـی کـورد وا بەدەرکـەوت بـۆ شـیمال
گوڵـشەنێکە وەك بەهەشـتە دوژمنـی بـڕوا لـە نـاو

شـێری بێـشەی مەعرەكـەی جـەنگ كـوردە باشـی تێبگـەن
میللـــەتێكی حـــەق بەدەســـتە نەســـرەت ئاســـاری بـــەناو
یابــە گــوێ بگــرە عــەزیزم نــەك بــە كــوردی تــێ نەگــەی
ســـــر ســـــریعاً یـــــا اخینـــــا[1] لاتقـــــف الا بفـــــاو
چـــاكە باڵێـــك ئاشـــكرا بـــێن ئێمـــە مووسلیـــشمان دەوێ
هەرچـــی پێـــی ناخۆشـــە بـــڕوا زوو بـــە زوو دەرچـــێ لـــەناو
چـــت لـــە دارو بـــەردی كـــوردە زیـــخ و قـــوم جێگاتـــە تـــۆ
زوو بـــڕۆ تێیـــدا بگـــەوزەو خـــۆت بـــدە بـــەر خۆرەتـــاو
خـــۆت و خورمـــاو پرتـــەقاڵت ، مێـــوژ و هـــەرمێ دەخـــۆین
گـــوێزو هـــەم بـــادام و قەیـــسی شـــانە هـــەنگوینمان لـــەناو
سووســـە مـــارو وردە ماســـی و هـــەم بـــزن مـــشكت هەیـــە
بزنـــــە كێـــــوی و شوورومامزخاســـــی كوردانـــــە تـــــەواو
ســـێوە لا ســـوورەی دهـــۆك و نانـــە هـــەنجیرو گـــەزۆ
ســـەیری قـــەزوان و بـــەڕوو كـــەو گێـــوژی پـــڕ تـــام و ئـــاو
تـــۆ لـــە جێـــی هـــەنجیری ژەنگـــار هـــەر كولـــەی عەنبارەكـــەی
دەیخەیـــە گیرفـــان و دەیخـــۆی دەم بـــە دەم هـــەر وەك پـــەلاو

١) راستییەكەی: (أخانا).

کورد کولەی ناخوا بە قورئان گەر بە گوللەش بیکوژن
هەم بەبێ پێلاو و دەرپێش فێر نەبوون منداڵ و پیاو
قوندەرەو شەلوالی فاسۆن عادەتی کوردی شیمال
تۆش کراسێکی درێژو کۆنە نەعلێکی دڕاو
فورسەتە زوو خۆت قوتارکە (عاصی) بۆ خوات پێ دەڵێ
عەیبە تەفرەو حیلە بازی وەعدمان وابوو تەواو

❊ ❊ ❊

(٨٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## لەو وەختەی کە شێخ مەحموود
## لە ئەشکەوتی (جاسنە) بوو، هەموو رۆژێ
## تەیارە بووردمانی دەکرد،
## لەبەر موتەئەسیری ئەوەم نووسی

یارەسووڵەڵلا چە جورمێکە کەوا ئەولادی تۆ
کەوتە ئەحوالی رەزالەت زومرەیی ئەولادی تۆ
چاوی نوتفەو نەسلی تۆیە پڕ لە ئەشکی حەسرەتە
هەروەکوو باران دەبارێ خوێن لە چاو ئەولادی تۆ
بێی لە هانای ئاهی سەردیان یارەسووڵەڵلا دەخیل
شوبهی ئەسحابوڕڕەقیمن ئەی شەها ئەولادی تۆ
ئەی شەفیعی جەمعی ئوممەت سەد کەڕەت تۆبە و ئەمان
بۆ شەفاعەت زۆرزەلیلن ئوممەت و ئەولادی تۆ
بێ نەواوودەردمەندن وان لە کەهفی زیللەتا

حەیـــدەری لوتفــت بنێـــرە بێنـــە دەر ئـــەولادی تـــۆ
هەستە کاکەحمەد بە قوربان تا بەکـەی تـۆ نایـە جـواب
بێ کەسە مەحموود کە ئیمڕۆ غـەرقی غـەم ئـەولادی تـۆ
غەرقی بەحری حەسـرەتی کـرد غـەدری کافرئـەی خـودا
چـاوەڕێی کەشـتی نـەجاتن دەم بـە دەم ئـەولادی تـۆ
بە شقی هـەر چـار یـاری خـۆت و رەوزەیـی ریزوانـی تـۆ
بێـرە ئیمـداد لوتـف فـەرموو بـێ کەسـن ئـەولادی تـۆ
وا لـە دەسـت زولمـی لـەعینان پـاك فـیرارن دەر وەتـەن
دەردی غوربەت زوعفی کردوون تـاك وهـەم ئـەولادی تـۆ
بـەحری لوتفـت بێنـە جونبـوش یـا شـەفیعە لمـوزنیبین
بەلکــە بــێ قــووەت دەبــێتن دوژمنــی ئــەولادی تــۆ
یــا رەسـوولەللا شـەفاعەت کـە گونـاه و هــەم خـەتام
سەد کە ( عاصی ) بم یەکێکم موخلیسی ئـەولادی تـۆ

(٨٦)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

# مەرسییە
# بۆ وەفاتی شێخ لەتیف شێخ مەحموود
# لەساڵی ١٣٩٢

لە نا و زومرەی مەلەك ئێمڕۆ عەجەب گریان و غەوغا بوو
کە نووری دیدەیی زەهرا بە وێنەی زوهرە ئاوا بوو
دڵۆپەی چاوەیی ئاسمان هەناسەی ساردی غەمخواران
بەهاریان کردەوە زستان فەلەك میزانی گۆڕابوو
لەتیفی جەرگی شێخ مەحموود بەبەرگی مەرگەوە ڕۆیی
بە ئەشکی خوێنی دڵسۆزان زەمین شێواو و شەیدا بوو
زرەی شیری ئەجەل هات و حەواڵەی دەستی قودرەت بوو
بلەوری گەردەنی لەت بوو کە موددەی ژیانی بەرپابوو

تەماشـای زاتـی کاکەحمـەد بیـساتی تەعزیـەی داخـست
بەریدی مەعنەوی فـەرمووی ئیـشارەی شـاهی لـەولا بـوو
ئەسەف بـۆ رۆژی روخـساری کەپـەردەی مـەرگ داپۆشـی
سەفینەی بەژن و باڵاکەی کە تێکچوو غـەرقی دەریـا بـوو
ئەمـە چـەند رۆژە میوانـە لـە خدمـەت بـاوك و بـاپیری
کە رووحـی شـیرنی رۆیـی بـە گـوڵزاری بەهەشـت شـابوو
لەبەر فرمێسکی پڕ حەسرەت نەما خاکێك بەسەردا کـەین
بەسەر چوو گوڵشەنی حوسنی کەسەر لەوحەی تەماشـابوو
شـکا پـشتی جەسـارەتمان کـە ئـەڵبورزی بڵنـد رووخـا
برووسکی مەرگی وا لێـدا بـە وێنـەی تـووری سـینا بـوو
غوبـاری ماتـەم و حەسـرەت سـلێمانی وەهـا داگـرت
ئەمە چەند وەختە بەو نەوعـە کـە رۆژهـەڵهات و ئـاوابوو
پـەژارەی کۆچـی ئـەو زاتـە لـە ئاسمـان ناگـەڕێ ژێـر بـێ
خەفەتبارانە ئیـستاکەش کـە نرکـەی رەعـدی پەیـدا بـوو
قەڵاتی عیززەتی کورد بوو بناغـەی میحـوەری تێـك چـوو
جەلای خورشیدی غیرەت بوو لەسەر سـەرمان کـەئاوا بـوو
لە دیدەی نەسلی کاکەحمەد بەعام فرمێسکی خوێن دەتکێ
ئەسەف چاوی لـەتیف ون بـوو کـە پـەروین و سـورەییابوو

لــەتیف و هــەم رەئــووف و تــۆ خوداوەنــدا ببــووره لێــی
لــە دونیــادا نــەجاتت دا کــە مــەیلی داری عوقبــا بــوو

تەمەننایی لە قــاپی حــەق بــە عــەفوو حورمــەتی بگــری
لە نەسلی حەیــدەرو زەهــرا بــە پــاکی هــات و پەیــدا بــوو

بیحەمدیللا کە تەئریخی لە ئەم چــوار نــاوی خــوا دەرچــوو
غفــورو هــادی و اللــه ودود بــۆ چــوارەم ئــەسما بــوو[1]

بە خۆێنی دیدە دەینووسم لــە لــەوحی دڵ غــەمی مــەرگی
مەڵێن (عــاصــی) ریابــازە لــە دەرحــەق بــاوکم هــەر وابــوو

* * *

[1] بەهای ژمارەیی چوارناوەکە، کەمێژووی وەفاتی شێخ لەتیف دەردەچێ. بەم جۆرەیە:
غفور=١٢٨٦
هادی=٢٠
الله=٦٦
ودود=٢٠
سەرجەم=١٣٩٢

## (٨٨)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن**
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

تۆ بە دەست دونیاوە (عاصی) تا بەکەی هەروا دەبی
دیار بە دیاری ئەو کەلاکەی مەست و بێ پەروا دەبی
ژیانی تۆ بەحرە لە دنیا پڕ نەهەنگی دەردو غەم
لاشەکەت پاپۆڕە ساحیل مەرگە لێی پەنهان دەبی
زوو لە دەریای زندەگانیت خۆت نقووم کە بۆ گوهەر
چونکە گەر دەستت بەتاڵ بێ وەك کەفی دەریا دەبی
دیتنی زاهیر غوباری چاوی باتینتە وەرە
خۆڵ بکە ناو چاوی زاهیر زوو بە دڵ بینا دەبی
ئەهلی بڕوا بە بەراستی کردەوەت بێ غەشش و پاك
تۆ لەمەعنای (کات)و (هەنجیر)[1] تیپی موستەسنا دەبی
خۆت مەکە ئەربابی قەومی سەرسەری هۆشت هەبێ
پاشی مردن سەربڵندو کیشوەروباڵا دەبی
ڕووکە ڕێبازی نەدامەت بۆ ڕەزامەندی خودا
مژدە بێتن لەو شەقامە تووشی عەفوی خوا دەبی

---

[1] یەعنی لە سوورەی( والعصر)و( والتین ). (عاصی)

وەك برووسـکە دێـت ودەڕوا ئافتـابی ژیـانی تـۆ

گـەر بـە پـاکی تێـی پـەڕێنی دیارەمـەردی خـوا دەبـی

هـەر پەشـیمانی لـە دوایـە عـومری زۆری بـێ عەمـەل

بـێ زەخـیرە و زادی تـەقوا ڕوورەش و ڕسـوا دەبـی

خۆت مەخە ژێربـاری دنیـا و عەبـدی سـامان و تەمـەع

خـۆت بپـارێزە شـەهیدی تیغـی ئیـستیغنا دەبـی

سـاحیبی ئەشـکی نەدامـەت ترسـی سـووتانت نـەبێ

تـۆ لـە سـەر پـردی سیراتا تووشـی چـەند دەریـادەبی

گەر هەناسەی سارد و ترسی خوای لە گەڵ بێ بـێ شـکە

هەم لەناو کـوورەی جەهەنـنەم موبتـەلای سـەرما دەبـی

شەو لە خەو هەستە بەراستی و ڕوولـە قـاپی حـەق بکـە

کارەبـات بـۆ دێتـە قـەبرو خـۆت چـرای عوقبـا دەبـی

تـۆ لـە ئـەم کاروانـسەرایە تاسـبەی میوانـە بـی

تـەپڵی مـردن لێ دەدەن بـۆت بـێ سـەرو بـێ پـا دەبـی

دووسـبەی تەشـریف دەفـەرمووی بـۆ ئـوتێلی عالـەمی

خـۆت دەزانـی چـەند بەرینـە هۆدەکـەی تێـی دا دەبـی

گـەر بـە زاخـاوی ڕیـازەت بـاش دڵـت مەسـقەڵ بکـەی

کاکی (عاصـی) مەسـتی خـەمری جەننەتولمـەئوا دەبـی

وەك سەگێكی هارە نەفست دوژمنی رووح و دڵە
زوو پەتی کە ئەو گەڵاوە مەردی بێ هەمتا دەبی
باش دەمت پاك کە لە غەیبەت هەم لە بوختان و درۆ
مەستی بادەی حەقپەرستی و رەحمەتی مەولا دەبی
فورسەتە تا ماوی (عاصی) روو لە غەفڵەت قەت مەکە
خۆشەویستی بارەگاهی حەزرەتی ئەللا دەبی

* * *

## (٨٩)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

مـەلا تاکـەی خوداوەنـدا دەبـی هـەر رووت و رسـوا بـێ
وەکـوو مزگـەوتی گـەرمك بـێ دلّـی وێـران و رووخـا بـێ
ئەسیرو پڕخەفەت دائیم لە دیـدەی ئەشـکی حەسـرەت بـێ
میـسالی ژووری مزگـەوتێ دلۆپـە مـەوجی تیـادا بـێ
منـالّی رووت وبـێ خـەرجی لیباسـی چلّکن و پـەڕتووت
حەسـیری ژووری مزگـەوتێ مەگـەر بەونەعـە پـچڕابێ
وەکوو ئـەم تـاقی هەیوانـە دەروونـی شـەق ببـێ یەکسەر
بـە وێنـەی رایـەلّی حـوجرە چـەمیوو خـوار وچـڕژا بـێ
دلّیان تاریك و پڕ غەم بێ وەکوو جـێ نوێژەکـەی مزگـەوت
مینابەندی لە چـوار دەورەی هـەمووی بـەردو مقـەببا بـێ
رەزیل و سووك و مەهتووك بن لە پێش چاوی هەموو عالەم
وەکـوو دیـواری مزگـەوتان دلّیـان هـەر وردو هـاڕا بـێ
مەلاو مزگەوت و شەرع و دین غەریب و بێ کەسـن یـارەب
بـە غـەیرەز تـۆ خوداوەنـدا ئـیتر پـشت و پـەنا نـابێ

ئــەوی مزگەوتــە یــارەببی بــە نــاوی مــاڵی تــۆ دیــارە
چ ســـرڕێکە دەخیلـــت بم کــە حــاڵی مــاڵی تــۆ وابــێ
تەماشــای دەرك و بانیــان كــەن چ خــوارو خــێچ و نارێکــە
دەشــوبهێتە دەم و لەوســی کەســێکی شــەپلە لێــی دابــێ
مەلاش غەمخواری ماڵی تــۆن لــە مزگــەوت شــرِترن دائــیم
دەبێ رووت و قەرزاراربێ وەیــا خــود شــێت و شــەیدا بــێ
ئەوانە وا کەمەر بەستەن لــە بــۆ ئینکــاری شــەرع و دیــن
لە ناو پــاوانی لــەززەت بــێ مــەقامیان تــاقی کیــسرا بــێ
بەرەسمی ئیلتیجــا نووســیم نــەوەك بــۆڕێی تەشــککی حــاڵ
کە چونکە غەیری قاپی تۆ چــە جــێ جێــی ئیلتیجــا نــابێ
وەرە بــبرِە زمــانی خــۆت بــە مــەودای تیغــی (لایُــسأل )
ئــیتر واز بێنــە ئــەی (عاصــی) قــەدەر چــۆنە دەبــێ وابــێ

❊ ❊ ❊

(٩٠)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەكفووفی مەحزووف)

ئــــەو داوە کـــەداتناوە ئەگـــەر بێـــت و وەهـــابێ
ئــەو مەحکەمــە بــا عائیـــدی دیــوانی خــودا بــێ
فیکــرێ بکــە لــەو دەردە کــە تــۆ داتــە دڵــی مــن
زۆر حەیفــە ســەداقەت بــە غــەش و روو و ریــا بــێ
وا دیــارە کــەمن موســتەحەقم بۆیــە وەهــات کــرد
وا باشــە جــەزای ئــەهلی وەفــا جەوروجــەفا بــێ
ئــەم دەردە لــە دڵمایــە هــەتا رۆژی قیامــــەت
وەك فــەخری ریسالەت لــە حــزوور زاتــی خــودا بــێ
مــن غــەیری خــودا نیمــە ئــیتر پــشت و پــەناهی
تۆش کاکە حەمــەت قــووەت و هــەم پــشت و پــەنا بــێ
داوامــــە لــــە ئــــەلتافی خوداوەنــــدی تــــەعالا
تامــــاوە ســــەبەبکاری برینــــداری قــــەزا بــــێ
هەرچــەندە کــە (عاصــی)م و لــە مەولایــە تەمــەنام
ئەنــــدامی موعینــــت هــــەدەفی تــــیری بــــەلابێ

* * *

## (٩١)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

موحەممەد ئیبنی عەبدوللا ئیمامی کەعبەتوللا بێ
لە دونیا حاکمی فەرد و لە قیامەت دا شەهنشا بێ
کەسێ بێ حوکمی شیری ئەو بە عالەم گەردەنی کەچ کا
کەسێ بێ گەردی نەعلەینی کە دورڕی تاجی عیسا بێ
کەسێ بێ حەزرەتی ئادەم کە فەخری پێ بکا دائیم
کەسێ بێتن لە مەحشەردا لیوایی حەمدی ئالابێ
کەسێ بێ جەننەتولئەعلا بە بۆنی ئەو موعەتتەر بێ
کەسێ بێ موهری سەرشانی یەدی بەیزایی مووسا بێ
لە دەرحەق ئەو کەسە چ بڵێم تەقەددوم لەو نەکا جبریل
مەقامی دەعوەتی زاتی لە بالای عەرشی ئەعلا بێ
توخوا پێغەمبەرێك بێتن بە قامك مانگی دوولەت کا
ئیتر چە بلێم لەوەی زیاتر کەسێ بەم نەوعە بالابێ
کەسێ بێ نووری دینی ئەو لە دنیادا پەخش بووبێ
کەسێ بێ عەبدی دەرگانەی لە عیززەت دا شەهنشابێ

کەسێك بێ ڕۆژی قیامەت هات شەفاعەتخواهی (عاصی) بێ
وەهـەم خـەتمی نوبـووەت کـا لـە قورئـان نـاوی تاهـا بـێ
کەسێك بێ ئاسمـان تـەی کـا بەیـەك لـەحزە شـەوی ئیـسرا
بگاتـە قابـە قەوسـەین و لـە ساحەی دەشـتی ئـەدنا بـێ
موسـلمانان مـەرەنجێنن دڵـی پێغەمبـەری خۆتـان
کەسـێك بـێتن ئیتاعـەی ئـەو ئیتاعـەی زاتـی مـەولابێ
لـە زومـرەی ئومـەتی تۆمـە دەخالـەت یارەسـوولەڵلا
چلۆن (عاصـی) لـە قیامەتـدا ڕەزیـل و ڕووت و ڕسـوا بـێ

* * *

(٩٢)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

**( ئەمە بە موناسەبەتی ئەو رۆژە بوو کە مەلیك فەیسەڵ هاتە سەرتەختی مەلەکی و لە کوردان کەسێك نەبوو داوا بۆ کوردان بکات کە ئەوانیش لە خاکی خۆیان گەورەییێکیان هەبێ بەناوی حوکمەتی. منیش لە ئەسەفی ئەوە ئەو شیعرانەم نووسی .)**

دڵم دەستی بە شیوەن کرد لــە حەســرەت بێکەســی کــوردی
لە چنگ تورکان نەجاتیان بــوو ریاســەتیان عــەرەب بــردی
هــەتا دەمــری بناڵێنــە ئــەتۆ ئــەی کــوردی بــێ ســاحیب
تەماشای مەزرەعەی ژیانت چلۆن سەرمای خەفــەت بــردی
لە بەر بێ بــاك و نــاڕێکی لــە رێگــای چــەوت و تــاریکی
بــە دائــیم وێــڵ و ســەرگەردان درشــت و گــەورە وو وردی
ئەســەف بــۆ خــاکی کوردســتان درایــە دەســتی بێگانــە
ئەتۆ ئەی کوردی خاوەند ماڵ چ بــوو لــەم وەختــەدا مــردی

تەماشای خاکی خۆت ناکەی هەمووی زێڕە لە دەستت چوو
بە قانوونی خەرافاتی لە میرات بێ بەشی کردی
هەتا ماوی گەلێ عەیبە بلێی کوردم لە ناو عالەم
لە خۆت ناگەی لە بەرپێی دوژمنان پردی [(1)]
دەبینی قەومی بێگانە دەلێی شێرن ئەتۆش چۆنی
لە بەربێ ئیتتیفاقیتان گرفتاری دو سەد دەردی
زبانمان زۆر درێژکردو ئەسەفەف دەستمان گەلێ کورتە
رەواجی سککەمان حەیفێ فسۆسی تەفرەقە بردی
لە ناو بازاڕی هەستیدا دەزانی بۆچی بێناوی
لە بانقی یەککەتی ناوخۆ چەکی مایەت نیفاق بردی
بە فیشاڵ و قسەی بێ جێ دەلێی شێرم ئەمان چ بکەم
تەماشای قەلفەتی خۆت کە بە کەللە هەروەکوو گردی
نەبوو کوردێك ئەوێ رۆژێ بلێ ئێوە خودا حافیز
عەزیزم خاکی کوردستان سەراپا موڵکە بۆ کوردی
بە (امش) و (شتگول) و(شترید) ئیدارەی کوردیەت نادرێ
ئەسەف ئینگلیزی دین دوژمن کە تەسلیمی ئەوی کردی

[1] ئەم دێرە رەش کراوەتەوە و دووبارە لە پەراوێز نووسراوەتەوە. سێ تەفعیلەیە، واتە تەفعیلەیەکی لە دێڕەکانیدی کەمترە.

ئـــەدی بۆچـــی ئەوێـــستاکەش شـــعوورێکتان نـــەبوو ئێـــوە
بە هێزی بای نیفاقی خۆت بـە دائـیم تـۆزو هـەم گـەردی
بەحیلـە و قونبولـەی نەکبـەت وەهـا لێکـی ترازانـدوون
لە جادەی یەککەتی لایدان عەجەب دووچـاری سـەد دەردی
گوتم ئۆخەی لە کوردستان کە ئەولادیان موسەفقەف بـوون
ئەسەف تەختەی سەقافەتیان هەمووی بەربۆوە سـەرعەردی
رجاتـان لێدەکـەم کوڕگـەل ئـەمن (عاصـی)م خەفـەتبارم
ئەگـەر تۆزێـك شـعوورم بـوو هـەوای فیـشاڵی تـۆ بـردی

❊ ❊ ❊

## (٩٣)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

له خۆت وریا به ئەی وریا بـه عـەقلّ و دیققـەت و وردی
له (شت گول ) چاکه وازبێنی وەره سەر له هجەیی کـوردی
له خۆشی هەرچی (ماگتله ) وەره بێـدەنگ بـه ئـەی وریـا
خـەیالّت بـۆ جنـوب گیانـه خـەیالّی خـاوه بـابردی
کەلیمەی (وێن چنت ) کەلّکی نـەماوە تـێ بگـه..........[1]
بلّـێ کـوردم بلّـێ مـەردم بـه مەردانـه ئەگـەر مـەردی
ئـەتۆش ئـەی کاکـه وریـا بـه نەشـێوێن بـچنه لای دەریـا
..................................................................[2]
به راستی پێت دەڵێم وریا عەتابـه کـەڵکی کـورد نـاگرێ
وەره رووحـت ئـەتۆ ئـاو دە بـه حـەیرانی رەسـوول گـەردی
بـۆ رەزای حـەق تێبکۆشـه گـوێ لـه (عاصـی) راگـره[3]
چـەکەلکی پێـوه نییـه دنیـا ئەگـەر ببیـه ئـەبی وەردی

*   *   *

---

[1] ئەم لەتە لە کۆتایی دا شتێکی کەمە.
[2] لێرەدا لەتێك کەمە.
[3] ئەم لەتە لە سەرکێشی رەمەڵی هەشتی مەحزووفە.

(٩٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

## ئەوەش بۆ ڕۆژی حەفلەی حاجی قادر نووسیم ئەگەرچی هێشتا نەکراوە

حـــاجی قـــادر تـــۆ نـــەمردووی تـــا قیامـــەت نـــامری
هەرچـــی کـــوردە تـــۆ لـــە دڵیـــا دائیمـــا هـــەر حـــازری
جەوهـــەری تیغـــی زبانـــت تیـــژە وێنـــەی زولفـــەقار
دولـــدولی نـــەزمی ڕەوانـــت شـــاهیدە بـــۆ مـــاهری
شـــیعرەکانت وەك چـــرایە ســـەیری ئەدرەوشـــێنەوە
بۆیـــە یـــادت وا لـــەدڵمان هـــەر دەســـووتێ ئـــاگری
تـــۆ کەشـــەهبازی شـــکارەندازی عـــەقڵ وحیکمـــەتی
بـــووی بـــە صـــەڕڕافی خەزێنـــەی شـیعری دوڕڕوگەوهـــەری
مژدە بێ بۆ ڕووحی پاکـت سـەد هـەزار ڕەحمـەت لـە تـۆ
کـــورد گڵـــۆپی نیـــشتمانە هـــانی تـــۆ بـــوو پـــاتری
بۆتـــە لـــەیلا بـــۆ هـــەموو کـــورد حوســـنی دیـــوانی ئـــەتۆ
بۆیـــە وێڵـــی ناوجەبـــەل بـــوون چەشـــنی قەیـــسی عـــامری

کورد هـەمووی دەروێشی تۆیە یادوفیکری تۆ دەکەن
ڕۆژی زیکری چەندە خۆشە زیکری حاجی قادری
دانە دانە ، دانە دوڕبوون وەك سەدەف بۆ فکری تۆ
ڕەهنمای غیرەت دەکاتن پشت بە پشت بۆ شاتری
دێ لە کوردستانی ئێمە ئیمڕۆ سۆزی موخلیسان
گشت کەمەربەستەی هیواتن وا بەرەسمی چاکری
دەنگی تەبریکە لە هەرلا داروبەردیش هەر دەڵێن
قەومی کورد جەژنت موبارەك لێدە تەپڵی نادری
خاسەتتەن کۆیە و وڵاتی تاجی فەخری بۆ ئەوان
شێری ناو بێشەی مەلاحەت شاهبازی شاعری
بووبە سەرمایەی جەسارەت شیعر و مەعناو جەوهەری
هاندەری جەنگ و نەبەردن خۆت لە سەنگەر ڕاگری
دەست بنێنە دەستی یەکتر لێك ببوورن مەبنە شاە
تاکو ببنە سەددی پۆڵای پێشی قەومی کافری
وەك لە فیکری کورد گەیشتن هێزی ئیستیعمار هەڵات
کلکی نا سەرشانی ڕایکرد چەشنی گۆلکی سامیری
رووکەنە قاپی خوداو و زۆر سوپاسی ئەو بکەن
ئەو نموونە دەست بە دەست هات گەییە عەسری حازری
بنەئێك و دووبرا بن چاوەکەم کوردو عەرەب
دوژمنی دینە خەریکە فتنە بازی و ساحری

پشتی یەك بگرن دەخیلە كاكی كوردی بەسیەتی
چی بەسەر هاتووە شعوورت رێی حەقیقەت ناگری
پشت لە خوا كردن بە قوربان تێی بگەن هەر نەگبەتە
دۆستی خوابن گەر هیوایە خۆ لە مەیدان راگری
دین قەلاتە هەردو چاوم یەككەتیشە ئەسلیحە
تۆ كە ئەو دوانەت نەبێتن خۆت لە بەركەس ناگری
مامە حاجی كاكی (عاصی) وەك كە دیتی جەوهەرت
وەعدی داوە تابمێنێ تەركی كاتن شاعیری

* * *

(٩٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

ئـەی پـەناهی بـێ نـەوایان شەهـسواری مەحـشەری
وەی شـفیعی عاسـییان و تـورڕەداری مهتـەری
سـورمەیی بینـایی عالـەم خـاکی تۆیـە ڕەوزەئـت
فـەخری ئینـسان و ئەجیننـە دانـە دوڕڕو گەوهـەری
وەسـفی میعراجـی ئەتۆیـە سوورەیی ئەسـرا تـەمام
بـووە شـەرەفداری قـدوومت لـەوح و عەرشـی ئەکبـەری
ناوی ڕووی تۆیە لە قورئان خوا کە فەرمووی (والضحی )
نـاوی نـای تاهـا و یاسـین ناسـیخی هەردەفتـەری
خاتـەمی ڕوتبـەی نوبـووەت پێـشی ئـادەم وەسـفی تـۆ
تـۆی لـەناو پێغەمبەرانـدا هـەم ڕەئـیس و سـەروەری
بولبـولی بـاغی جـەلالی ڕووگـوڵی بـالاّ بلـوور
ئافتـابی ڕووی زەمینـی تـۆ عـەجایب ڕەهبـەری
خیلعـەتی لـەولاکی تـۆ بـوو باعیـسی خـەلقی عـەدەم
هەم لە سـایەی تـۆ بـو جوملـە مەسـنەدی پێغەمبـەری

ئینتیــــزاری لـــوتفی تۆنـــه ئـــه‌نبیاو و ئـــه‌ولیاء
چـه‌شمه‌یی ده‌ریـایی ره‌حمـه‌ت تـۆ کـه سـاقی که‌وسـه‌ری
عــه‌یبی زۆره (عـاصـــی) ئیمـــڕۆ بـــێ ره‌واج وقیمه‌تـــه
بـــێ ئومێـــدی لـــوتفی تۆیـــه بـــۆ ئـــه‌یاغان مـــشته‌ری

*　　*　　*

## (٩٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

حەمدو لیللا کوندی نەگبەت وا لەناو کوردان فڕی
بازو پیرۆزە کە هاتن ورگی شوومیان هەڵدڕی
بای نەسیم لوتفی خووا بوو باوەشێنی کوردی کرد
ئاگری فیتنە لە ناومان گورگی هار بوو دەرپەڕی
شێری ئاشتی کەوتە شوێنی رایڕفاند تا کلکی گرت
ئاگری بەردایە عومری تاکو توبا لێی خوڕی
رووح و ویجدان وشەرەف هات گەییە سەر ئەوجی مراد
دەستی دا شمشیری عەدل و ساختەکاری گوێ بڕی
مژدە بێ بۆ ئەو رەئیسە عومری نوێی نووسرایەوە
بەحری حیلمی مەوجی عەفوی عالەمی خستە حوڕی
بۆ بەیانی حەقق و تۆڵەی قەومی بێ چارەی فەقیر
زوو بەرۆکی زوڵمی گرت و تا بەدامەن دایدڕی
شێری مەیدانی شەجاعەت مەلجەئوومەئوای هەژار
مشکی نەحسی تێك شکاندو دەست بەجێ رووحی بڕی
وەك زەمانە بووبە کانتین بابەتی دانا تەواو
مشتەری فەزل وشەرەف بوو قەومی کورد هەردووی کڕی

گـــەورەکانی قـــەومی کـــوردی زۆر رجاتـــان لێ دەکـــەم
بینەیـــەك پارچـــە هـــەمووتان هەرچـــی رۆیـــی تێپـــەڕی
بـــەزمی شـــایی چـــەند جوانـــە تێکەڵـــە کـــورد و عـــەرەب
زۆر شـــوکر بـــەدگۆی فەســـادیش لـــەو میانـــە دەرپـــەڕی
بـــای ســـرووره رادەژێنـــێ ســـەیری بەیـــداغی نـــەجات
ئاوی ئەمنییەت لـــە ناومـــان ژەنگـــی شـــوومی زوو ســـڕی
هەر بژی با قەومی کـــورد و دەنگـــی (فلیحیـــا العـــرب )
بارەکـــەللا چـــۆن زمـــانی بـــەد زمـــانی زوو بـــڕی
فورســـەتە کەوتۆتـــە دەســـتمان ســـەد دەخیـــل خـــۆراگرن
ئەو کەســـە مـــەرد بـــوو لەمەیـــدان زوو نیفـــاقی ســـەربڕی
وازنەهێنن دەست وبـــرد کـــەن پـــشتی یـــەکتر بـــەر مـــەدەن
هێـــزی یـــەکرەنگی بـــەهێز کـــەن رۆژی رۆیـــی و تێپـــەڕی
لێك ببـــوورن مـــەردی خـــوابن تـــا نیفـــاق سامتان نـــەبا
چـــاو لـــە یـــەکتر زوو بپۆشـــن وەك پڵـــنگ بـــن بـــۆ دڕی
وەك بەشیری هاتنـــە مەیـــدان هـــەر بەشـــیری بـــچنە پـــێش
واز لـــە دوولایـــی بهێـــنن وەك بـــە خـــوێن خاکتـــان کـــڕی
چـــونکە هـــاودین و زمـــانین حەیفـــە بـــە خـــودا تەفرەقـــە
رووت لـــە زنـــدانی بـــەلا کـــا بـــەدزمانی ســـیخوڕی

هـــەر برابـــوون هـــەربرابن کاکـــەگیان کـــوردو عـــەرەب
بۆچـی کـورد بـێ بـەش بمێنـێ عالـەمی پـێ هەڵپـەڕی
گـوێ مـەدە باسـی ئەوانـە دیـن کـە کـوردی خـستەدوا
ئەو کەسەی پشتی لەدین کرد سەیری کە چۆن تێ تڕی[1]
بـا لـــەناو تۆمـــاری مێـــژوو نـــاوی ئـــەم ڕۆژە بنـــێن
جێژنی ئیستیقراری کورد و هـەم عـەرەب تـورك و لـوڕی
خواش مـەرەنجێنن لـە خۆتـان ئەلئـەمان و سـەد دەخیـل
لوتفی خـوا بـوو پـشتی خـستن خـاکی کوردتـان دابـڕی
پـشت بـەخوا بەسـتن عـەزیزم ڕەنجـەڕۆن گـەر وانـەبن
شێری خوا بـە هـەردو چـاوم گەرچـی پـیری هـەر کـوڕی
یـا ئیلاهـی هـەر بمێنـێ تـا ئەبـەد ئـەم خۆشـییە
وا لـەناو کـوردی عیراقـا کونـدی نەگبـەت هـەڵفڕی
زۆر بە عیـزەت هـەر بـژی کـورد تـا فەلـەك دەورانـەکا
شـێر و شـێر بەچـچە بمێـنن بـێ خیلافـات و شـەڕی
(عـاصی) تەبعی چەند خەیاتە چۆن لەیـەك پارچـەغەزەل
هەربەئەنـدازەی شـەجاعەت ئـەم کـەوا جوانـەی بـڕی

❊ ❊ ❊

[1] یەکەمجار نووسیویەتی: (خوا حەیاتی لێ بڕی ) ، پاشان سڕیویەتەوە و ئەمەی نووسیوە.

(٩٧)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

سەفرەی سەفەرم سەفرە سەفەرنابی بە سەفری
زۆر حەیفە کەوا زالم و بێ دیققەت و فکری
دووجەردە لە سەر رێتە بەبێ زاد و سیلاحی
وا چاکە هەتا ماوی لە ئەم حاڵەتە بگری
سەرفی بکە هەنگاوی ژیانت بە عیبادەت
بەڵکوو بە ئەربابی سەفا دەرچی وو بمری
دیققەت بکە لەو سوورەتی قورئانە دەڵێ چی
کە دەڵێ ( ان الانسان لفي خسر )
گەر عاقڵی تا ماوی ئەتۆ قورکە بە سەرتا
دەرحەققی بە ئینعامی خودا ناقسی شوکری
واز بێنە لە ئەم حاڵەتی بێ باکییە (عاصی)
واکاتی سەفەر هاتووە وە بزانە لە قەبری .

* * *

(٩٨)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

(لە بۆ ئەو برایانەی کە ئەربابی تەریقەتی قادری و نەقشبەندین ، لە رووی نەسیحەت نەك لە رووی ئینکاری نووسیومە . هەرجارە کە گویٚ لە شیعرەکانم بگرن بزانن ئامۆژگارییە یا ئینکارییەو عیبرەت و تەئسیری لیٚ وەربگرن هەتا رەنج بە خەسار نەبن )

## لەرووی نەسیحەت بۆ دەرویٚش و سۆفی

وەرە ســـۆفی تەمـاشـــا کـــە بـــەریش و کەڵلـــە وەك شـــێری
ئـــەدی خـــۆ نەفـــسەکەت مێیـــە لـــەلای خۆشـــت ئـــەتۆ نێـــری
لـــەناو بیٚـــشەی ریـــاو عـــوجبی لـــەریٚی ئیخلاســـی لاداوی
هـــەتا دەمـــری بـــەبیٚ ئـــیخلاس بـــە ئـــەو مـــەککارە نـــاوێری
لە حاڵی خۆت ئـەتۆ جـاریٚ تەفـەککور گـەر بکـەی ئـەوجا
بەڕاستی تیٚ دەگەی گیانە کە چەند بـیٚ کـەڵك و بـیٚ خێـری
حـەیا ناکـەی لـەلای مورشـید بـە خۆشـت تـۆبلێی پیـاوم
ئەسـیری ئـەو زەعیفـەی بـی دەڵێـی ئیفلـیج و شـەوکوێری

ئەگەر بێت و بە عەقڵی خۆت لە دەردی دڵ بگەی جارێ
کە سەرتاپا بریندارە بە حیلە و نووکی شمشیری
بە خوێنی جەرگە دەست نوێژی هەموو ئەهلی سلووك دەروێش
ئەتۆش پرچە هەموو مایەت بە زەرگ و هەڵپەڕین فێری
ئەگەر تالیب بەراستی بی سیراتولموستەقیم رێتە
لە ضاڵی ومەغضوبی حیفزی لە سیفرەی نیعمەتا تێری
کەسێ لەم رێیە گەر لادا لە ئینعام دوورە وەك ئەنعام
ئەتۆ سۆفی وەکوو رێوی ئەتۆش دەروێش وەکوو نێری
بە زیکر و فیکری مەولایە عیلاج و تۆڵە وەرگرتن
وەهارێتە ئەگەر مەردی وەها بمری دەڵێم شێری
لە زندانی ریازەت دا پەتی تەقوای لە گەردەن کە
مودیری سجنی ئیخلاس بی ئەگەر حەزکەی هەڵێدێری
دڵت خستۆتە بەر دەستی زەعیفەی دوژمنی دینت
لە لای خۆت مشتەری فەیزی بە بێ مایەش لە بازێڕی
لە جێگەی سەفووەتی قەلب و چرات بۆ غورفەیی تەوفیق
بە قەسوەت رەش بووە قەلبت لەراستی عەیبی خۆت کوێری
بە جارێ داتە دەست نەفست لغاوی ئیختیاری خۆت
بە دائیم بۆیە جاسووسی لە گۆشتی غەیبەتیش تێری

بـه بـۆراقی تەمــەع هــەرگیز بـە قودســی قودسـیان ناگــەی
تەمات وایـە لـە نـاو جەننـەت  لـە گـەڵ جبریلـی رابـوێری
لە پایەی رەفرەفی عــەزمت هــەتا سەرعەرشـی مەقـسوودت
لـە رێـی میعراجـی ئامالـت بـە دائـیم هــەر سـەرەو ژێـری
تــەریقت حەققــە بیللاهــی عیلاجــی خــۆت بکــە مــونکیر
گـەلێ وریـا بـە مــامی خـۆم ئـەتۆش کەوتوویـە هەڵـدێری
وەها خۆت دەردەخەی (عاصی) لە ژەنگی مەعسییەت پـاکی
بـە ملیۆنـە ئـەتۆ عــەیبت لـە سـەد هەرچـواری بـژمێری .

❊ ❊ ❊

(٩٩)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

## (لەوەختی ئەسیر کردنی شێخ مەحموود )

دەزانن بـۆ چ موبـەددەل بـوو جیهـان ئیمـڕۆ بـە زولـمـانی
غوبـاری غـەم ئـەوا پۆشـی جـەمالی یووسـفی سـانی
لە دیدەی ئاڵی کاکەحمەد سـەراپا ئەشـکی خـوێن دەڕژێ
بریـنـی خـستە جـەرگ و دڵ بـە جـارێ تـیری هیجرانـی
تەماشاکەن فەلەك چی کرد لە هەرلا مەفرەزەی غەم هات
هوجوومی کردە سەرشادی کە حەسـرەت بـوو قومانـدانی
تەماشای چیهرەیی ئاسمان لـە بـەر شـیوەن چـلۆن شـینە
دەڵـێ رۆیـی لـە نـاو کـوردان سـلێمانی سـلێمانی
لە هەر لا هەوری میحنەت هات رەش و تاریك و پڕ بەرقە
بلێـسەی میحنەتـە ئیمـڕۆ ئەسـەف وا بۆتـە بـارانی
لە سـینەی ئـەهلی مـەعنا دێ سـەدایی یـا رەسـولەللا
بـە خێـر بابێتـەوە یـارەب جـەنابی حەیـدەری سـانی
وەرن ساداتی کوردسـتان فیـداتان بـێ سـەری (عاصـی)
بکێـشن غیرەتـێ قوربـان کـە رۆیـی مـاهی کـەنعانی

* * *

(١٠٠)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

**( لە گەڵ حاجی حەمەدەمین شەریك بووین . لە قەلعەدزە رۆنێکی زۆرمان بۆ هاتبوو . رەئیسی بەلەدیە ، ناوی نابەم ، داوای یەك دوو حوققە رۆنی کرد ، نەمان دایە. ئەویش ئیعلانی کرد ئەو رۆنە بۆ گەنە نابێ بفرۆشرێ و نابێ لێرەش بڕوا . منیش ئەوەم ناردە خزمەت جەمیل ئاغا .)**

رەعییەت باغی شاهانە کە هەردەم میوە دەرژێنێ
حیمایەتکاری شاهانە بە ئیجراحوکمی بنوێنێ
لە پاسی مێگەلی رەعیە دەبێ وەك شوانی شوانکارە
لە ژێر قاپووت لە سەر گۆچان دەبێ دووچاوی هەڵبێنێ
نەبێ غافڵ لە هەرلایێ وەگەرنە زامنە قوربان
لە شەڕی دز لە چنگی گورگ لە ناو گێژاوی دەربێنێ
هەموو دەعبا موهەبیایە لە گۆشتی رەعیە عەوداڵە
تەلەش دانێ لە بۆ ڕێوی نەوەك پەرژینی بشکێنێ
لە چوار ئەترافی عالەمدا بکا پەرژینی بەدکردار
لە سەر شوانە بکا حیفزی چەقەڵ ئەولاکە نەڕفێنێ

ئەوانـەی حـاکمی وەخـتن دەبـێ جارجـار بکـەن تـەفتیش
وەگەرنە چنگی قەهری خوا هـەموو ئەنـدامی دەشـکێنێ
دەمێ پۆلیس دەمێ مەئموور دەمـێ ئاغـا دەمـێ نۆکـەر
هـەموو حـازر وەکـوو جـەردە کـڵاوی رەعیـە بڕفێنـێ
منـی بێـچارە بـۆ ئێـرە لـە دەسـت زالـم فـیرارم کـرد
ئیتر سەد خۆزگە بۆ جاران لە دەسـت ئـەحوالی گـەرمێنێ
لە ژێر خەتتی عەدالەت دا دەبـێ مـل کـەچ ببـێ حـاکم
لە بەردەستی شەریعەتدا دەبـێ خزمـەت بـە جـێ بێنـێ
نـەماوە حاڵـەتی پێـشووم نـەماوە تاقـەتی رەشـوەت
فـەنا بـوو ئیعتبـاری زووم هـەموو ئەشـیایە دەربێنـێ
لەژێر سایەی ئەتۆ قوربان منی (عاصـی) چـییە تـەدبیر
قرارناکـەم بـە هـیچ نـەوعێ نەکـەی لـوتفی بگـونجێنی

❊ ❊ ❊

## (١٠١)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

بە کوردی پێت بڵێم ئەی کورد لە دونیادا هەتا ماوی
دەبێ ژێردەستی عالەم بی نیفاق واروو حی کێشاوی
بەهێزی یەککەتی سەیری کە جوو چی کرد و چی لێهات
لە حاڵی خۆت بفکرە تۆش کە چەند مەهتووك و بەدناوی
ئەوێ رۆژێ ئەتۆ فەوتای بە دوو دەعوای درۆکەوتی
وتت دین کوردی دواخستووە تەماشاکە چلۆن پیاوی
دەخیلە ببنە یەك ئەوجا هەوێنی دینی تێکەڵ کەن
دەبینی حاڵی ئێستای خۆت دەڵێی شیری بزرکاوی
لە باتی یەککەتی یەکسەر هەمووی لێك دوژمنە عالەم
دەسیسەی ئەجنەبی تۆی کوشت دەڵێی بێ عەقڵ و بێ چاوی
لە جێی قورئان و شەرعی حەق کتێبی ئەجنەبی ناپاك
لە دڵتا بۆتە سەرمەزهەب لە گشت ئەرکانی تۆراوی
تەماشای زیخ وقوم ناکەن کەیەکتر ناگرن هەرگیز
چەمەنتۆی تێکە دەبینی دەبێتە بەردی رەنگ ماوی

ئـــیتر بەســـیە بـــە نامـــەردی چ ژیانێکـــە ئـــەتۆ تێـــدای
لە خـــۆت ناگـــەی لـــە ســـەر دینـــە کـــەوا بـــێ هێـــزو پـــڕژاوی
بـــە قورئـــان پێـــت بڵـــێم کاکـــە هـــەتا وابـــی دەبـــێ وابـــی
نیـــزام و شـــەوکەتت نـــابێ خـــەیاڵت خـــاوە هـــەرخاوی
وەرن دامێنـــی یـــەك بگـــرن فەشـــەل نـــابن لـــە هـــیچ کـــاتێ
خـــودا گـــەریاری کـــارت بـــێ ئـــەتۆ شـــێرانە خوڵقـــاوی
حەقیقەت بوو گوتی (عاصی) ئەتۆش چی پێ دەڵێـی بیڵـێ
ئەگـــەر باوەڕنەکـــەی گیانـــە لـــە گێـــژی فیتنـــە خنکـــاوی

*    *    *

## (١٠٢)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

بــە رەنــگ ورایحــە و لــەززەت نموونــەی جەننەتــە چــایی
وجوودی مــووجیبی کەیفــە ، نــەبوونی حەســرەتە چــایی
بەلاغی نوتقە بۆ عالــەم چــراغی شــەوقە بــۆ مــەجلیس
نــەزەرگاهی دڵــە هــەردەم عــەجایب نیعمەتــە چــایی
لە تاریکی شەوی غەمــدا ســەماوەر شــەمعە هەڵــدەکرێ
هەموو کەس بۆتە پەروانە کــە دەفعــی میحنەتــە چــایی
بەناڵەی ســینە دەروێــشە بــە ئەشــکی خــوینی دڵ ریــشە
بــەدەفعی غەفڵــەت ونووســتن یەقینــە ســەفوەتە چــایی
لە تەکیەو خانەقاو مزگەوت بــە دائــیم رابیتــەی دەکــرێ
دو سەد تــەئویلی بــۆ دەکــرێ حزووری عیــسمەتە چــایی
مەحەببەت پــیرو هــەم پــیرە هــەتا منــداڵی یــەك ســاڵە
رەفیقــە بــۆ ســەفەر یــاران ئەنیــسی وەحــشەتە چــایی
بەغــەیرەز ئــەرزە لونناســان نییــە غەیبەتکــەری چــایی
خەواسان شاهیدن (عاصی) کە ئەهلی مەدحەتــە چــایی

❊ ❊ ❊

(١)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

## بە موناسەبەتی رۆیشتنی عالەم.بۆ چیاو دێهاتان و چۆڵ کردنی جێ و ڕێی خۆیان و پشت دانەیەك بۆداوای وەتەن و باران و سەرمای زۆر

یـا رەسـوولەللا دەخیلـە فـەخری جوملـەی کائینـات
هەوری نەکبەت گشتی داگرت عەرسـەگاهی کائینـات
رووکــە دەرگـــەی بارەگـــاهی کارســـازی کائینـــات
وا شـــەپۆلی بـەحری فیتنـە غـەرقی کـردووە کائینـات
ئـەشـرەفی ئـــەولادی ئـادەم یـا رەســـولەللا نـەجات
سەدئەسەف تێکچوو نیزامی خۆش حـەیاتی کوردەکـان
تیپ بە تیپ منداڵی مەعسووم چوونە شاخ و کێوەکـان
وا لـە بـەر بـاران و سـەرما هەردەگریـەن بـێ وچـان
رووت و برسـین بـێ ئومێـدن پـاکی بێـزارن لـە ژیـان
ئـەی پەنـاهی بـێ پـەنایان یـارەسـولەللا نـەجات

گێژەلوولەی بای نەدامەت گێـژی کـردین خـاص وعـام
گەردەلوولی گەردی حەسرەت لوولی دا سـەحفەی قیـوام
صاعیقەو بەرق و برووسکەی سۆزی سینەی ئەهلی فـام
ئـــاگـــری بەردایـــە دنیـــا ئـــەی حـــەبیبی لایەنـــام
کـــاتی ئیمـــدادە بـــە قوربـــان یارەســـوولەللا نـــەجات

دەنگی گریەو رۆڵە رۆیـە خـەڵکی لادێ و ئـەهلی شـار
سەیری کە فرمێسکی چاویان بۆتە خوێن و دێتـە خـوار
گـشتی شـێواون لـە داخـا هـەر دەلـەرزن بـێ قـەرار
دایە وس بە دەنگی تۆپـە ئێـستا عەسـکەر دێنـە خـوار
ئەی ئومێـدی قـەومی بێکـەس یـا رەسـوولەللاّ نـەجات

بابە برسیمە بە قوربان ئاخ لە بـۆ یـەك پنجـە [1] نـان
چـاوی بابـت خـوا کەریمـە وا دەچـم بـۆ دێیـەکان
گەر بە رووحیش بێتە دەستم [2] بۆتی دەکـرِم رۆڵـەگیان
مـــن ژیـــانم نـــاوێ بـــێ تـــۆ نامـــەوێ دنیـــاو زەمـــان
ئـــەی تکاکـــاری رەزیـــلان یـــا رەســـولەللاّ نـــەجات

---

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (کەرتە ).
[2] لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: ( دەست کەوێتن ).

هەستە ئافرەت نەك بترسێن زوو بگە منداڵەکان
گرمە گرمی تۆپ و بۆمبا قرچەقرچی دۆشکەکان
ناڵەناڵی هەورو باران بیانبەنە ئەشکەوتەکان
تاکو دەتوانی لەگەڵ خۆت بیبە بۆیان چێشت و نان
ئەی هیدایەت خواهی عالەم یارەسولەللا نەجات

دایە باوکم کوا لە کوێیە کوا برام وخوشکەکان
ئەحمەد و زاناوو نەسرین چییان بەسەرهاتووە ئەوان
رۆڵە باوکت خوای لەگەڵ بێ دوێنێ عەسکەر کوشتیان
پاشی باوکم بۆچی بژیەم توخودا ئەی دایەگیانَ
ئەی حەکیمی دەرد و ئازار یارەسولەللا نەجات

جەرگی داکت قەت مەگریە رۆڵە توخۆت راگرە
زوو سیلاحی تۆڵە ساندن چاوی داکت هەڵگرە
ئینتیقامی نیشتمان و خوێنی باوکت وەرگرە
دوژمنی قەوم و وەتەنتان مانەوەی وەك ئاگرە
تاجداری تاجی عیزەت یارەسولەللا نەجات

رۆڵە هێزی کوردی ئیمرۆ چەشنی دەریای بێ بنە
چەندی دیارە ئەو لە جەبهە سێ ئەوەندەش هەر ونە
گشت لە رێگای نیشتماندا ئارەزوویان کوشتنە

رووبــەرووی دوژمــن ئەوەســتێ ژیــانی خــۆی لامردنــە
ســەد دەخاڵــەت شــاهی لــەولاك یارەســولەللاّ نــەجات

وا دەچــم بــۆ جەبهــە ئــافرەت گــەردنم ئــازا بکــە
گەر ئەمن کوژرام مەگریــە بــەڵکو شــوکری خــوا بکــە
چــاوەدێری بەچــکەکانمان[1] بــاش و بــێ پــەروا بکــە
مــاڵ و ســەروەتمان گەلێکــە خزمــەتیان زۆر چــا بکــە
پــشــتیوانی ئــەهلی ئیــسلام یــا رەســولەللاّ نــەجات

چەند شــەریف و خانــەدان و مــەردی ئــازاو پــڕ هونــەر
عــاقڵی پڕ هــۆش و غــیرەت شــێری مەســت و بــەهرەوەر
رۆژی لێقــەومان هــەمووبان وەك پڵنگــی کینــەوەر
بــۆ فیــداکاری وەتــەنیان بــوون غــەریب و دەربــەدەر
چارەســازی قــەومی بێــچار یارەســولەللاّ نــەجات

چەند کەسانی ئەهلی حورمەت خانەدانی عــیلم و دیــن
وا لە ترسی زوڵمی بێ جــێ یــەك بەیــەکیان دەرپــەڕین
بێ ئیمــام و بــانگ و ئــەوراد مەعبــەدی دینــی مــوبین

---

١) لە دەستنووێکی دیکەدا نووسراوە: ( بەچکەکانم ).

غیرەتـــی تۆیـــە هیوامـــان [1] یـــا شـــەفیعەلموزنیبین
خاتـــەمی خـــەتمی نوبـــووەت یـــا رەســـولەللا نـــەجات
جێـــژنی مـــەولوودی کەســـێکە یـــا ئیلاهەلعالـــەمین
خـــۆت کـــە فەرمووتـــە لـــە قورئـــان (رحمـــة للعـــالمین )
رۆژی کـــەیف و شـــادمانی بـــۆ هـــەموو ئـــەربابی دیـــن
سەد ئەسەف بۆ قەومی کوردی موبتـەلای گریـان و شـین
ئـــەی چرای رێگای ســـەعادەت یـــا رەســـوولەللا نـــەجات
پێـــشی ئاسمـــانی هیوامـــان بۆتـــە ســـاحەی هـــەورو لم
شـــادمانی دایـــە پـــێش خـــۆی هێرشـــی لێـــشاوی غـــەم
زەحمـــەتی بـــاران و ســـەرما ترســـی فتنـــەش دەم بـــە دەم
روو لە کـێ کـەین ئـەی خودایـە ئومـمـەتی خەیرولئـەنام
ئـــەی دەلیـــلی رێـــی هیدایـــەت یارەسولەللا نـــەجات
هـــەر لەبـــەر خـــاتری قـــدوومی حـــەزرەتی فەخرولئـــەنام
لوتـف فـەرموو بـا خـلاس بـێ ئـەی خـودایی لایـەنام
مـوبتـەلای دەردو بـەلا بـووین یـائیلاهی خـاس و عـام
عالـەمی گرتۆتـە پـیش خـۆی ئـەم بەلایـە بیتتـەمام
یـــا محـــەممەد یـــا محەممـــەد یـــا رەســـوولەللا نـــەجات

---

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: ( ئومێدمان).

ئــەی شەهنــشاهی نوبــووەت یــا ئیمامەلمورســەلین
سەف شکێنی دوژمنی دیـن شـاریعی ئـەحکامی دیـن
مەهبەتی سـەرداری ئـەملاك یـەعنی جبریلـی ئـەمین

بێـــــرە فریامـــــان دەخیلــە بەشـــقی رەببولعالــەمین
فــاتیحی دەرگــاهی جەننــەت یــا رەســووڵلا نــەجات

کاکی (عـاصی) بۆچـی نـاڕۆی چیتە تـۆ لـەم قوژبنـە
ئێـــرە هێلانـــەی نـــەجاتی پیرەمێـــردی وەك منـــە
پــشتیوانی مـــن خودایـــە مـــن چ بـــاکم دوژمنـــە[1]

ئەی حەبیبی زاتی بێ چوون جەرگی (عـاصی) کون کونـە
ئـەی تـەبیبـی ئـەم بـرینـە یـارەســوولەللا نەجات[2]

۲ نیسانی ۱۹۷٤

*　*　*

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: ( خوایە پارێزگاری رووحم من چبکم دوژمنە ).
[2] لە پەراوێزدا نووسراوە : (ئەی رەئیس دین ودنیا یارەسوولەللا نەجات).

## (٢)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

بێ شك بەشەرێکە کە موسەففایە موحەممەد
خاکی قەدەمی جوملە موسەللایە موحەممەد
فەخری بەشەرو عالەمی باڵایە موحەممەد
نووری شەرەفی عەرشی موعللایە موحەممەد
شەهسواری سەری عەرسەیی عوقبایە موحەممەد

مانگی رەجەبە هەم شەوی میعراجە بە قوربان
یەك لەحزە کە دەرچووی لە هەموو زومرەیی ئاسمان
بەو مژدە مەلەك کەوتنەوە جونبوش و جەولان
سەف سەف هەمو هاتن بەئەدەب جوملە دەوەستان
ئیمشۆکە لەسەر دەعوەتی مەولایە موحەممەد

هەر کەس دەیەوێ جەننەتی بێ عەجزو مەلامەت
با بێتە دەری حەزرەتی سولتانی جەلالەت
مەعلوومە کە ئەو هادییە بۆ ئەهلی زەلالەت
شاهێکە کە رسکاوە لەبوستانی ریسالەت
ئیمڕۆ کە لەسەر پایەیی عولیایە موحەممەد

سـەیری بکـە ئـەم حورمەتـەلای خـالیقی بـاقی
جبریلـی کـەوا کـردە جلەوکێـشی بـوراقی
فـەرمو وەرە بـو کەوسـەر و تـۆ بوویەتـە سـاقی
قەوسـەینی دو ئەبرۆتـە لـە سـەر ڕێتـە بـەتاقی
کورسـی شـەرفی سـاحەیی ئەدنایـە موحەممـەد
(شەوی)[1] لێ بووردنە دەروازەیی ڕەحمـەت بلـەقێنن
نێزیکـە موحەممـەد هـاتووە ڕەف ڕەف بوەسـێنن
حـازربن و بەیـداغی مەحەببـەت بـچەقێنن
بـۆ حورمـەتی ئـەو گـەردن و سـەر دابنەوێنـن
میـوانی خوداوەنـدی تەعـالایە مـوحەممـەد
قورئـانی قەدیمـە بـووە بورهـانی بـەقووەت
یـەك ئایـەتی خـوا کافییـە بـۆ ئـەهلی مـورووەت
مەعلومـە لـە لای عالـەم وهـەم ئـەهلی فوتـووەت
سـەر دەفتـەرە بـۆ دائیرەیـی ئـەهلی نوبـووەت
ڕۆژێـکی زیابەخـشە هووەیدایـە موحەممـەد
مەعلومـە موبـەللیغ ئـەوە بـۆ ئـەمرو مـەناهی
خـاڵی لـە کـەلامی بەشـەرە صـیدق و گـەواهی
موسـتەغنییە عەبـدی دەری بـۆ مەسـنەدی شـاهی
دانێکـە لـە بـەحری کـەرەمی لـوتفی ئیلاهـی
دوڕڕی سـەدەفی ئـادەم وحەووایـە موحەممـەد

---

(١) ئەم وشەیە لە رووی کێشەوە زیادە. ئەمەپێی دەگوترێ (خزم).

گــەر تــالیبی ئــەلتافی حــەق و خولــدی جینــانی
ســابیت بــە لەســەر دینــی ئــەوی شــاهی جیهــانی
مــەفهوومی کــەلامی حەقــە جــاری لــە زبــانی
بــاوەڕ بکــە شــاهێکــە بەبــێ ئــەووەل و ســانی
مــەحبووبی دەری حــەزرەتی مەولایــە موحــەممەد
تاکــەی لەجــەدەل مــالومی بــێ هــوش و خــەجلل[1]
ئــەی موفــسیدی دینــی حــەق و بــە دگــۆو مــوضــلل
بــۆ رەمــزی کــەلامی حەقــە کەشــشافی موحیــلــل
بــۆ خــەتمی نوبــووەت هــەموو قورئانــە مودیــلــل
خــاڵی وەکــوو مووســا یــەدی بەیزایــە موحەممــەد
ئــەو رۆژە لەســەر بــورجی نوبــووەت کەهــەڵات[2]
(والــشمس)لەســەر وەســفی جــەمالی کــەدەهات
لــەو شــوعلەیە زەڕرێکــی بــەرۆژ دا بــە خــەڵات
بــێ شــك ئــەوە ســەرمایەیی ئومێــدی نــەجات
فــەخری شــەرەفی یەســریب و بەتحایــە موحەممــەد

[1] چوار لەتی پێشەوەی ئەم پێنجینەیە لەسەر کێشی هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی ئەهتەمە.

[2] چوار لەتی پێشەوەی ئەم پێنجینەیە لەسەر کێشی هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی ئەهتەمە.

سـورەتی سـبحان الـذی کردوویـە بـەیان
بۆ مەقـدەمی ئـەو حەزرەتـە وەك فەرشـی لـە دیـوان
عـەرش و قەڵـەم و کورسـی یـو ئاسمـان[1]
ئـەی مـونکری میعراجـی نـەبی سـەیری لـە قورئـان
چـون شـاهیدی ئـەو سـوورەیی ئیـسرایە موحەممـەد
تـێ بفکـرە لـەم رەمـزە تـو ئـەی ئـەهلی ضـەلالـەت
ئەو رۆژە کە پێش کەوت لە هەموو سـەف بەئەمانـەت
ئەو نوێژە لـە سـەر فـەزلی ئـەوی بـوو بـە عەلامـەت
سـەرحەلقەیی دیـوانی جـەزا رۆژی قیامـەت
سـەرداری هـەموو سـاحیبی ئاڵایـە موحەممـەد
سەرگەشـتە لـە دیـوانی خـودا مـونکیری ئەحمـەق
واز بێنـە لـە جـەهل و جـەدەل و مـاددەیی موغلـەق
تـێ بفکرەتـو چـۆن بەغـەزەب خـۆت کـردووە مولحـەق
مەعلوومـە لـە ئینجیـل و زەبـوور کـافری موتلـەق
ئـەو تـاجی سـەری حـەزرەتی عیـسایە موحەممـەد
ئـەم بەندەیـە لـەم وەسـفە زبـانی کـە گـەڕاوە
ئـەو سـافی رەسـوولحەققە بـەو نەزمـەکراوە
هاونـاوی ئەویـە لـە تـەرەف فـەزلی خـوداوە
باکـی نییـە (عاصـی) بەهـەموو جـورم و خـەتاوە
کڕیـاری هـەموو ئایـەغی عوقبـایە موحەممـەد

❊ ❊ ❊

---

(٢) ئەم لەتە کێشەکەی تەواو نییە.

(٣)

## بەموناسەبەتی حەفلەی شەوی میعراج
## لە ٢٧ ی رەجەبی ١٣٩٢ لە کۆیسنجق
## نووسیم و خوێندرایەوە

بێ شك بە شەرێکە کە موسەففایە موحەممەد[١]
خاکی قەدەمی جوملە موسەللایە موحەممەد
فەخری بەشەرو عالەمی باڵایە موحەممەد
نووری شەرەفی عەرشی موعەللایە موحەممەد
سەرداری سەری عەرسەیی عوقبایە موحەممەد

مانگی رەجەبە هەم شەوی میعراجە بە قوربان
لەو کاتە بەسەر کەوتی لە سەر جوملەیی ئاسمان
ئەسنافی مەلەك هاتنەوە جونبوش و جەولان
سەف سەف هەمو هاتن بە ئەدەب گشتی دەوەستان
ئیمشەو کەلەسەر دەعوەتی مەولایە موحەممەد

(١)ئەم پێنجینە بەندە دووبار نووسراوەتەوە. لەزۆر جێگادا جیاوازی گەورەی لەگەڵ ئەوەی پێشوو هەیە، بۆیە دووبارەمان کردەوە و هەر بە ئاماژەی پەراوێز نەوەستاین.

سـەیری بکـە لـەم حورمەتـە لای خـالیقی بـاقی
جبریلــی کــەوا کــردە جلەوکێــشی بــوراقی
فــەرموو وەرە بــۆ کەوســەرو تــۆ بوویەتـە سـاقی
قەوسـەینی دوئەبرۆتــە لــە سـەر رێتــە بـە تـاقی
بـــەرزی شـــەرەفی ئایـــەتی ئەدنایـــە موحەممـــەد

لێ بوردنـــە دەروازەیـــی رەحمـــەت بلـــەرێنن
تەشـــریفی موحەممـــەد هـــاتووە رەف رەف بوەســێنن
حـــازر بـــن و بەیـــداغی مەحەببـــەت بـــچەقێنن
بـــۆ حورمـــەتی ئـــەو گەردنـــە ســـەر دابنـــەوێنن
میـــوانی خوداوەنـــدی تەعالایـــە موحەممـــەد

هەر کەس دەیەوێ جەننەتی بێ عـەجز و مـەلالـەت
بابێتـــە دەری حـــەزرەتی ســـولتانی جەلالـــەت
مەعلوومە کە ئەو هادییـە بـۆ ئـەهلی ضـەلالـەت
شـــاهێکە کەرســـکاوە لـــە بوســـتانی ریـــسالەت
ئیمرۆکــە لــە ســەر پایــەیی عولیایــە موحەممــەد

قورئـــانی قەدیمـــە بـــووە بورهـــانی بـــە قـــووەت
یـەك ئایـەتی خـوا کافییـە بـۆ ئـەهلی فوتـووەت
مەعلوومە لە لای عالەم و هـەم ئـەهلی مـورووەت
ســـەردەفتەرە بـــۆ دائیرەیـــی ئـــەهلی نوبـــووەت
رۆژێکـــی زیابـــەخش و هووەیدایـــە موحەممـــەد

مەعلوومــە موبــەللیغ ئــەوە بــۆ ئــەمر و مــەناهی
خــاڵی لــە کــەلامی بەشــەرە ســیدقی گــەواهی
موستەغنییە عەبــدی دەری بــۆ مەســنەدی شــاهی
دانێکـــــە لـــە بـــەحری کـــەرەمی لـــوتفی ئیلاهـــی
دوڕڕی ســـــەدەفی ئـــادەم و حەووایـــە موحەممـــەد

گــەر تــالیبی ئــەلتافی حــەق و خولــدی جینــانی
ســابیت بــە لــە ســەردینی ئــەوی شــاهی جیهــانی
مــەفهوومی کــەلامی حەقــە جــاری لــە زبــانی
بــــاوەڕ بکـــە شـــاهێکە بـــەبێ ئـــەووەڵ وســـانی
مـــەحبووبی دەری حـــەزرەتی مەولایـــە موحەممـــەد

تاکــەی لــە جــەدەل مــالومی بــێ هــۆش وخجــڵ
ئـــەی دوژمنـــی دینـــی حـــەق وبـــەدگۆ و مـــضلّ
بـــۆ رەمـــزی کـــەلامی حەقـــە کەشـــشافی موحیـــلّ
بـــــۆ خـــەتمی نـــەبووەت شـــاهید ئایـــاتی مـــودلّ
خـــاڵی وەکـــوو مووســـا یـــەدی بەیزایـــە موحەممـــەد

ئــەو رۆژە لەســـەر بـــورجی نوبـــووەت کــە هــەڵات
وەشـــشەمس ولەســـەر وەســـفی جـــەمالی کەنـــەهات
لـــەو شـــوعلەیە زەڕڕێکـــی بـــە رۆژدایـــە خـــەڵات
بـــێ شـــك ئـــەوە ســـەرمایەیی ئومێـــدی نـــەجات
فـــەخری شـــەرەفی یەســـریب و بەتحایـــە محەممـــەد

سـووره‌تی( سـبحان الـذی) کردوویـه بـه‌یان
بۆ مه‌قده‌می ئـه‌و حه‌زره‌تـه وه‌ك فه‌رشـه لـه دیـوان
عـه‌رش وقه‌ڵـه‌م کورسـی یـو ئاسمـان
ئـه‌ی مـونکیری میعراجـی نـه‌بی سـه‌یری لـه قورئـان
شاهیدی[1] فه‌زل وشه‌ره‌فی سـووره‌یی ئیـسرایه محه‌مـه‌د

تێ بفکره له‌م زه‌مزه‌مه تو ئـه‌ی ئـه‌هلی ضـه‌لالـه‌ت
ئه‌و شه‌وه پێش که‌وت له هه‌مـوو سه‌ف به ئیمامـه‌ت
ئه‌و نوێژه له سه‌ر فه‌زلی ئـه‌وی بـوو بـه عه‌لامـه‌ت
سـه‌رحه‌ڵقه‌یی دیـوانی جـه‌زا رۆژی قیامـه‌ت
سـه‌رداری هـه‌موو سـاحیبی ئالآیـه موحه‌مـه‌د

سه‌رگه‌شـته لـه دیـوانی خـودا مـونکیری ئه‌حمـه‌ق
وازبێنه لـه جـه‌هل و جـه‌ده‌ل و مـادده‌یی موغلـه‌ق
سه‌یری بکه چـۆن تـۆ به‌غـه‌زه‌ب بوویه‌تـه مولحـه‌ق
مه‌علوومـه لـه ئینجیـل و زه‌بـوور کـافری موتلـه‌ق
تـاجێ لـه سـه‌ری حـه‌زره‌تی عیـسایه موحه‌مـه‌د

ئـه‌م به‌نده‌یـه لـه‌م مه‌دحـه زبـانی کـه گـه‌ڕاوه
ئه‌وسـافی ره‌سـوولی حه‌قـه بـه‌م نه‌زمـه کـراوه
هاونـاوی ئه‌وێـه لـه تـه‌ره‌ف فـه‌زڵی خـوداوه
بـاکی نییـه (عاصـی) بـه هـه‌موو جـورم و خـه‌تاوه
کـرِیـاری هـه‌مو ئـایه‌غی عوقبایـه موحه‌مـه‌د

١٨/ شعبان /١٣٩٢

---

[1] وشه‌ی (شاهید) له‌سه‌ره‌تاوه زیاده، ئه‌مه له عه‌رووزدا (خزم)ه.

(٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

## هاواربردن بۆ خزمەتی پێغەمبەر
## هەتا رجامان بۆ بکات
## (صلی الله علیه وسلم تسلیما ...)

یــا رەســوولەللا چ قــەوما ئــاگری بــوغزو حەســەد
کەوتە ناو ئیسلام بەجارێ گشتی ســووتاند نیــك و بــەد
غولغولەی فیتنــە و فەســادی هاتــە دنیــا بــێ عــەدەد
زەهــــری میقرۆبــی نیفاقــە لێکــی کــرد بــاب و وەلــەد
ئەلئــەمان ئــەی فــەخری عالــەم یارەســوولەللا مــەدەد

سەیری جەرگی ئەهلی مەعنا چۆن بەجارێ بوو بەخوێن
دووکەڵی سۆزی هەناسەی چەند هــەتیوانیش کــە دێــن
ئاهی سینەی گەرمی مەزلووم وا لە کووچەو شارو دێــن
خوێن لەدیدەی ئەهلی سەفوەت دێتەخوارێ وەك (دەڵێن)[1]
وەختــی ئیمــدادە دەلیلــە یــا ڕســوولەللا مــەدەد

---

[1] جۆگایەکە لە لای ئەلەبجە. (عاصی)

بـەزمی راکێـشان وکوشـتن وا لـەناومان بـوو بـە بـاو
نالـە نـاڵی بـاب کـوژاو و ئاخـەئاخی کـوڕ کـوژاو
ژن لە سەر جادەی دەسـووڕێ بـێ نیقـاب روو هـەڵکراو
قـەومی ئیـسلام لێـك تـرازا بـوو بەسـەد فیرقـەی تـەواو
ئـەی سـوپەهـ سـالاری عالـەم یارەسـوولەللا مـەدەد

ئیعتیبـاری هـیچ نـەماوە قـەت حەدیـسی ئـەنبیا
گاڵتەچـی ئـەهلی عـەوامن ئـەهلی عـیلم و ئـەولیا
خـوارو مـەهتووك و رەزیلـن قـسمی پـاکی ئـەتقیا
حورمـەتی قورئـان نـەماوە بـوو غەلـەت ریـێ ئیهتیـدا
سـەییدی ئـەولادی ئـادەم یارەسـوولەللا مـەدەد

دین لە ناو عالەم بە جارێ وەك هـەتیو بـێ داك وبـاب
مەسئەلەی ماددەی حەیامان سەد ئەسەف نەیما غیتاب
بۆ تە عـەیب و لۆمـەکاری پێـچەوو پـەردەو وحیجـاب
لای درۆیـە یایـە خـانم قیامـەت و حەشـرو حیـساب
مەتلـەعی نـووری نوبـووەت یارەسـوولەللا مـەدەد

گـەر نەیـە ئیمـدادی ئیـسلام حـاڵی کەوتۆتـە شـڕی
هـەر بزانـە نـووری ئیمـان وا لـە نـاو دڵ هـەڵفری
هەڵپـەڕین و چـەپڵە لێـدان زوو حـەیایان سـەربڕی
بەحـسی مزگـەوت و جەماعـەت گـەروەها بـێ تێپـەڕی
بـەدری ئاسـمانی ریـسالەت یا رەسـوولەللا مـەدەد

ئــاگری ئینکــاری دینــی وا بــنه شــیددەت هــەڵگرا
دینــی ئیـسلام چـووه پـەناوەو حـوکمی قـانوون دەربـڕا
بۆیـه چـەند منـداڵی سـاوا بـێ گونـاه بـوو سـەر بـڕا
چەنـــد مـەلای حـەقگۆ بەناهـیـەق گـشتی پێقـەی دادڕا
ئـەی خەزێنـەی گـەنجی ئیعجـاز یـا رەسـوولەللا مـەدەد

بوونـــه مفتـــی حـــاڵی حـــازر جـاهیلی ناخوێنــدەوار
زەهری دینــه گفتوگۆیـان پیـسترن سـەت قـات لـەمار
هەرچـی دەیلـێن هـەر درۆیـه حیلـه بـاز و دەم بـەهار.
دوژمنـــی شـــەرع وحەدیــسن بــێ وەفــاو و بــێ ویقــار
واســـیتەی کارگـــاهی ئیجـــاد یارەســـوولەللا مـــەدەد

ئەی حەبیبی زاتی بێ چوون هاتــه فــەوتان ئومـەتت
هیچ پەناو مەلجەء نـەماوه غـەیری قـاپی غیرەتـت
(رحمـــة للعـــالمین )ی تــۆ بــه روتبــه و شــەوکەتت
بێـــژه یـارەب بێتــه جونبـوش مـەوجی دەریـای رەحمـەتت
جەرگی (عاصی) پـڕ لـه خۆینـه یـا رەسوولەللا مـەدەد

❊ ❊ ❊

(٤)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

مـــن گـــەدایی دەرکـــی خـــۆتم پادشـــاهی ئەرجومەنـــد
رووت و قووت و بـێ نـەواوو بـێ شـعوورو موسـتەمەند
کـوێرە چـاوی دەرکـی مـەعنام ئینتیـزارم بـۆ مـەدەد
کەوتمەداوی نەفس وشـەیتان تـۆوی چـاکەم قـەت نەچـەند
شـــاهی شاهان مورشـیدی خـۆم یـا عەلائـەددین مـەدەد
چوو لەدەستم عومری گەنجیم رووم لە تاعەت قەت نەکرد
سەد ئەسەف بۆ ڕۆژی قیامەت هیچ لیباسم قەت نـەکرد
حەسرەتا چۆن بچمە مەحـشەر چـاکەیێکم قـەت نـەکرد
غەیـری قاپـــی غیرەتـــی تـۆ چـارەییێکم قـەت نـەکرد
شـاهی شـاهان مورشـیدی خـۆم یـا عەلائـەددین مـەدەد
چـونکە ژیـانم گەییـە ئـاخیر خـەم بـووە مـن قامـەتم
شـاهی مــن تــەدبیری دەرمــان بـێ زەخـیرەی قیامـەتم
ئیـــستەکەش پیروزەعیـــف و عـــاجزو بـــێ تاقـــەتم
بـۆتـــە پـــەردە وا لەســـەر دڵ قەسـوەتی بـێ غایـەتم
شـاهی شـاهان مورشـیدی خـۆم یـا عەلائـەددین مـەدەد

وا لەناو بەحری قەساوەت کەوتمە سەر مەوجی خەتا
گەر سەفینەی نووحی لوتفت بێ نەجاتی دڵ بدا
تا لەدەستم دەر نەچێتن سیلسیلەی رێگەی خودا
هیچ پەنا و مەلجەء نەماوە هەر دەڵێم یا شاه عەلا
شاهی شاهان مورشیدی خۆم یا عەلائەددین مەدەد
موددەتی ژیانم تەواوە هاتە سەر رۆژ و سەعات
یا دەقیقە و زەڕڕە ماوە یا نەفەس دەرچوو نەهات
وا لە هەنگاوی سەفەردام رێگەشم هات و نەهات
نەفس وشەیتان بوونە جەردە وان لە سەر جادەی نەجات
شاهی شاهان مورشیدی خۆم یا عەلائەددین مەدەد
چیم لە ژیانی عەسری ئێستا وەختە شێت بم بێ ڕیا
تێ دەفکرم هەر بە جارێ پەردەیی عیسمەت دڕا
بۆتە عەنقا ناوی ماوە جەوهەری ماددەی حەیا
دین و تەقوا بوونە گاڵتە حورمەتیان لای کەس نەما
شاهی شاهان مورشیدی خۆم یا عەلائەددین مەدەد
دەستی من دامێنی تۆ بێ تۆی کە سوڵتانی جیهان
بمخە ژێر قەبزەی ئەمانەت ئەی رەئیسی عارفان
من نەخۆش و دەردەدارو تۆش تەبیبی حاڵ زان
سەد دەخالەت ئەی حەکیمی دەردی زومرەی (عاصی)یان
شاهی شاهان مورشیدی خۆم یا عەلائەددین مەدەد

## (٥)

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان**
**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان**
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

یا ئیلاهــی عەبـدی (عاصــی ) وا لــەقاپیت بـۆ ســوئال
چــەرخی قــودرەت وا دەســووڕێ هاتــە ســەرپایەی مــەلال
میللــەتی ئیــسلامی تێکــدا دائــیرەی ئــەهلی ضــەلال
هەر خــەریکی دینــی حــەققن تــاکو بیکــەن پایــەماڵ
ئـــــەی خــودایی بــێ شــەریك و پادشــاهی زولجــەلال
چــی بەســەرهات دینــی پــاکی حــەزرەتی فەخرولئــەنام
شەرع وئایات و حەدیسیان خستە پشت گوێ بیتتــەمام
چــوونە ســەر خــوو وو ڕەوشــتی مولحیــدی بــێ ئینتیــزام
غــەیری تــۆ کێیــە بپرســێ دادی مــەزلووم و عــەوام
چـــــاوەڕێی لوتــف وعــیلاجین پادشــاهی زولجــەلال
قەترە ئاوێــك بــوو حــەیامان ســەد ئەســەف ڕۆیــی تکــا
شیشەیی سەفوەت بەبــەردی میحنــەت وقەسوەت شــکا
وا پــەنامان بــردە بــەر فــەخری ریــسالەت بــۆ تکــا
کــێ هەیــە یــارەب عیلاجــی ئــەم قەزییــەی تــا بکــا
ئــەی خــودایی بــێ شــەریك و پادشــاهی زولجــەلال

تابەکـــەی گریـــان و شـــیوەن یائیلاهەلعالـــەمین
تا بەکـەی هـەروا برێـژم مـن لـە دیـدە ئەشـکی خـوین
غەیری قـاپی رەحمـەتی تـۆ ئـەی خـودا بـۆ کـوێ بـچین
روو لـە کـێ کـەین یـا ئیلاهـی ئەنتـە خـەیروڕڕاحمین
ئـــەی خـــودایی بـــێ شـــەریك و پادشـــاهی زولجـــەلال
بەسـیە بـا بـەس بـێ خودایـا دیـن رەواجێکـی نـەما
عـــاجزە لێمـــان دەخیلـــە شـــاهی خەتمولئـــەنبیا
عالەمیش لێك بۆتە دوژمن کەس بە کەس رەحمـی نـەما
وا لـــە گـــریان و فغـــانن قیـــسمی زومـــرەی ئـــەولیا
ئـــەی خـــودایی بـــێ شـــەریك و پادشـــاهی زولجـــەلال
چارەســازی ئــەم برینـــە و دەردی بـــێ دەرمـــان ئـــەتۆی
ســاحیبی ئــەرزو ســەماوو راحــیم و رەحمـــان ئـــەتۆی
بێ کەس و بێ ماڵ و بـێ جـێ خـالیقی سـوبحان ئـەتۆی
خاوەنی کورسی وو عەرش ولەوح وهـەم ئاسمـان ئـەتۆی
بێنـە جونبـوش بەحری رەحمـەت پادشـاهی زولجـەلال
بۆتـە ئـاگر چـۆل و سـەحرا هـەم جیبـال و کۆلـە شـیو
عالـەمی سـووتاند بـە جـارێ ئـەم بەڵایـە نیـو بـەنیو
چەند منـاڵی جـوان و ناسـك بوونـە بـێ بـاب و هـەتیو
ئەی پـەناهی بـێ پـەنایان حـازرو هـەم کـەس نـەدیو
ئـــەی خـــودایـــی لامـــەکان و پادشـــاهی زولجـــەلال

تـۆ لـە بـەر خـاتری جـەنابی حـەزرەتی فەخرولئـەنام
هـەر بـە ملـوێن کـافرت هێنایـە بـن ئـالأی سـەلام
ئێمە خۆ هـەر ئومـەتی ویـن بـێ شـعوور و هـەم نـەفام
رەببی ئیسلاحمان بفـەرموو تێك نەچێ با ئینتیـزام
ئـەی خـودایـی بێ شـەریك و پادشـاهی زولجـەلال

سەد ئەسەف رۆیی لە دەستمان جەهەوری عیلم و ئەدەب
قیمـەتێکی وای نـەماوە حورمـەتی ئەسـڵ و نەسـەب
بوونە دوژمـن وا لەگـەڵ یـەك فـارس و کـوردو عـەرەب
قەت لە هیچ ترسیان نەماوە سەدهەزاران ئەی عەجەب
ئـەی خـودایی بـێ شـەریك و پادشـاهی زولجـەلال

مـن کـە عەبـدێکم خودایـا رووسـیا هـەم زۆر دەنـی
شەرمەسـارو پـڕ گونـاه ومـن فـەقیر و تـۆ غـەنی
(لا تـردوا الـسائلین ) م مـن کەبیـست دڵ پێکـەنی
ئایـەتی ( لاتقنطـوا ) شـم هاتـە یـادو بـووم خـەنی
ئـەی خـودای عـەفوو کونەنـدە پادشـاهی زولجـەلال

بەشـقی شـەوخیزانی سـادق دائـیرەی ئـەهلی سـەفا
هەم بە حـەققی رەوزەیـی پـڕ نـووری ئەحمـەد موسـتەفا
رەحم فەرموو بـا خـەلاس بـێ ئەزیـەت و جـەورو جـەفا
ئـولفـەتێکمان بێنـە نـاوا عـالیمی سـڕڕو خـەفا
ئـەی خـودایی بـێ شـەریك و پادشـاهی زولجـەلال

من که (عاصی)م ئەی خودایا تۆش غەفوور و هەم رەحیم
لێم قبـوولٚ کـه ئـەم دوعایـه یـا موجیـب و یـا حـەلیم
بـا لەگــەڵ مــالوم نەچــینه دۆزەخ و نــاری جــەحیم

بـا نـەرەنجێ شـاهی لـەولاك یـا رەئـووف و یـا رەحــیم
ئــەی خـــودایی بـێ شــەریك وپادشـاهی زولجـەلال

❊ ❊ ❊

(٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

پێ لە حەلقەی داوی نەفسم بێ شعوور بووم بوومە دیـل
وا لەناو زیندانی شەهوەت دەست و پـێ بەسـتەو زەلیـل
حەسحەسـم شـەیتانە دائـم حـوببی دونیاشـم دەلیـل
سـەد دەخالـەت یـا موحەممـەد پێـشەوایی جبرەئیـل
ئەی چـرای ئـەرزو سـەماوات یارەسـوولەللا دەخیـل

دەوری داوە وا لــە قــەلبم جونــدی شــەیتانی لــەعین
خاســـسەتەن خەنناســـی پیـــسی کردەیـــارو هەمنـــشین
هــەر خەریکــە دایبپۆشــێ تــا بــە پــەردەی کفــروکین
تــۆی پەنــاهی بێ نەوایــان (یا شفیع المذنبین )
کۆڵەگەی کەعبەی هیدایەت یا رەسـوولەللا دەخیـل

چـونکە نــاوم مــستەفایە یــەك لــە زومــرەی ئوممــەتم
هــەر لــە ئــەووەل تــاکو ئیمــڕۆ دینــی تۆیــە ئولفــەتم
حەیفــە وا بــێ کــەس ئەسـیرو بەنــدیواری نەکبــەتم
سەد دەخیل ئەی شاهی لەولاك رووکە دەرد و زیللـەتم
دەوڕڕی تــاجــی مورســەلینان یارەسوولەللا دەخیل

هەڵکرووزا باغی عومرم زۆر بە غەفڵەت بێ سەمەر
دەفتەرم گشتی گوناهە ئەحمەدی خیرولبەشەر
رووت و بێ مایەو خەجاڵەت دەستە ئەژنۆ قوڕبەسەر
بۆ دەخالەت هاتمە قاپیت ئەی شەفیعی نامەوەر
شەهسواری دەشتی مەحشەر یارەسولەللا دەخیل

تۆ هەتیوێك بی بە تەنها ئیستیلای میللەت بکەی
چەند هەزاران ئەهلی شەوکەت فەتح و بێ عیززەت بکەی
یا بەیەك ئەنگوست لە ئاسمان جورمی مانگ دوولەت بکەی
دیارە دەتوانی بە لەحزێك دێوی نەفسم پەت بکەی
مەزهەری نووری تەجەللا یا رەسوولەللا دەخیل

کێوی توور بوو بۆ موناجات خاسسی موسایی کەلیم
خاتەمی خەتمی نوبووەت تووری تۆ عەرشی عەزیم
وەك شەوی میعراج کرایە شافیعی زومرەی ئەسیم
چۆن بترسێم من لە دۆزەخ تۆ شەفیع و خودا رەحیم
ئەی مەقامت قابە قەوسین یارەسوولەللا دەخیل

قاسیرە فیکرم لە وەسفت ئەی حەبیبی لایەزال
نایەتە بەر حەددی زیهنم زیاد لەمە فەزل وجەلال
وەك لە دنیا بەینی پەنجەت بوو بە سەرچاوەی زولال
وا لە سەر بەحری شەفاعەت هاتمە دەرگەت بۆ سوئال
تاقەسواری دەشتی ئەدنا یارەسوولەللا دەخیل

مشتەری هەرتۆی لـە قیامـەت بـۆ ئـەیاغی ئومـەتت
دەوڵەمەنـدو پایـە بـەرزی هەربـە مایـەی حورمـەتت
کـەمترینی ئومـەتی تـۆم بمخـە قـەبزەی عیـسمەتت

مەزهـــەری لوتفی ئەتۆ بیٚ بەنـدەیی بـیٚ مروەتـت
کەعبەیی مەقسوودی عالـەم یارەسـوولەللا دەخیـل

ئایـــەتی (لاتقربـــوا ) بـــۆ عالـــەمی وا تێگەیانـــد
خوا لە گـوڵزاری نوبـووەت تـۆی بـە خاتـەم پیٚگەیانـد
بۆیە دەرکەی ئەو مەقامە هیچ کەسیٚ قـەت نەیلەقانـد

نـاوی نای خەیرولخەلایق زۆر بە عیززەت تـۆی ژیانـد
ئەی تەبیبی دەردی (عـاصی ) یارەسـوولەللا دەخیـل

* * *

## (٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

وەك تەماشای سەروی قەددی دڵبەری جانانەکەم
یانە مەیلی وەسلی لەیل و غونچەیی خەندانەکەم
هەروەکوو مەجنوون لە داخا روو لە سەر هەردانەکەم
ئەی موسڵمانان بزانن رۆژو شەو گریانەکەم
ئاگری دووری کە کەوتە سینەیی بریانەکەم

پادشاهی عیشق هات و لە شکری هێنامە سەر
جەزبی مەقناتیسی حوسنی جەرگی وا هێنامەدەر
بۆیە وا بێدڵ دەسووڕێم بێ نەواوو دەربەدەر
بێکەسم کەوتوومە داوی دڵڕفێنی قوڕ بەسەر
بۆیە ئیستیعفا لەدونیاو دەوڵەت و هەم ژیانەکەم

من کە سەرگەشتەم لە دونیا وا مەزانن بێ دڵم
دائیما غەرقی خەیاڵی مەوسیمی وەسڵی گوڵم
عالەم ئەیزانێ لە دەورەی لێوی غونچەی بولبولم
وەك بە ئومێدی تەماشای لالەزارو سونبولم
روو لە ئەگریجە و دو زوڵف و پەرچەمی رەیحانەکەم

بۆیــه بــازارِم لــه بــاغ و گوڵــشەن ولالــەو چــەمەن
دەردی دووری هاتـــه نـــاودڵ کردییـــه داروئـحـــەزەن
نامەویَ ژیـانی لــه دووری دەوڵــەت ومــاڵ و وەتــەن
قـــەت بـەیارنابن لــه جـوانی ســەروولالەو یاسـەمەن
لــەعلی کــوڵمی وەك دەبیــنم غەیبــەتی مەرجانەکــەم
من له مەستی چاوی مەستت مەستی بادەی دڵبەریم
ســاحیبی نــەزمی رەوان و شــعری دوڕڕوگەوهــەریم
جەوهەر ئەفرۆشم بە قوربــان وا مەزانــه سەرســەریم
زوهـــرەڕوو هـــاتوومه ســەودا بۆویســالت مـشــتەریم
مامڵەتیش قوربان بە عەقڵ و رووح و قەلب و جانەکـەم
وشــکه ســۆفی بۆیــه دائـیم دڵــرەقن هــەم دڵڕەشـن
جوملەیان لەم عیلمی عیشقه زۆر نەفام و بیَ بەشـن
قەلبی قەلبیان بیَ رەواجه چونکه گشتیان رووکەشن
سەیری کەن عاشق له حوســنا وەك گــوڵێکی رووگەشــن
بۆیـــه تەحســـینی وەزیفەی عاشـــــق و رەندانــه کــەم
بۆیه لەم بەحره بە دائـیم گێـژ دەخـوا وەك ماســییه
عیــشقبازی رێــی نــەجات و جــادەیی خــوا ناســییه
زاهیدی خود بین کە چونکه دیلـی نەفـسی قاســییه
رۆژو شەو غەرقی خەیاڵی عەیب و عاری (عـاصی ) یـە
خــۆ منیـــش تەحسیلی عیشق و خزمەتی خووبانەکـەم

(٨)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

حەمدی زاتی بێ شەریك و خالیق وسوبحانەکەم
شوکری نیعمەت بۆ تەماشای ئایەتی قورئانەکەم
ئیقتیدای قەولی سەحیحی فەخری ئینس و جانەکەم
ڕوو لە بەیتوڵلاوو شەرعی ناسخی دونیا نەکەم
پێڕەوی بووبەکرو فاروق هەم عەلی وعوسمانەکەم

شوکرولیللا دڵ کە کەوتە حەڵقەیی داوی کەمەند
بۆتە سەیدی شاهبازی پادشاهی ئەرجومەند
حەزرەتی عەتتاری سانی خواجەیی هیممەت بڵەند
بوو بە دەستگیرم لە عوقبا جێنشینی نەقشبەند
فەخرە بەو کەمتر غولامە بازەکەی گەیلانەکەم

بێ نەواوو دەردمەند و بێ موعین و بێ کەسم
وا بەبێ ئاگر دەسووتێم سینەریش وقاقنەسم
عاشقی زیبا ڕوحێکی سوخمە زەردی ئەتڵەسم
وەك عەلائەددینی سانی بۆتە شای فریادرەسم
ڕوویی ئیستیمداد لە قوتب و پیری هەورامانەکەم

بۆتـــەواوی دڵ تـــەبیبی وەك ســـیراجەددین ببـــێ
رۆژی قیامـــەت پـــشتیوانی وەك بەهائـــەددین ببـــێ
بـۆ شـەوی غەفڵـەت سـورەییای وەك زیائـەددین ببـێ
بـۆ نەجاتیمان لە شەیتان شاهی نەجمەددین ببـێ
روو بە مەجبووری لە قـاپی حـەزرەتی سـولتانەکەم
تۆی کە غەوسولموستەمیددین فەرقی چییە نێزیك و دوور
ئەم دڵەی پـەت کـە بـە جـارێ بیخـە رێگـای شـارەزوور
تانەبۆتە حەپـسی خـاك و لوقمـەیی چـەند مـارو مـوور
بێ ویسالت لێم حەرامە جەننەت و حوورو قوسـوور
ئـارەزووی دیـداری تـۆوو خالیـد و عوسـمانەکەم
گەر ئەتۆ لوتفـت هـەبێتن نامـەوێ قـەت قـەوم وقیـل
ئاگری لوتفت کە هەڵکـەی هیممەتیـشت بـووە دەلیـل
کافییـە گـەر تـۆ نەزەرکـەی تـەن دەبێتـە ئوتمۆبیـل
جێژنی قوربان گەرچی رۆیی ئەی شەهی مەولا دەلیل
مـن لە ژێـر دامێنی پاکت رووح و سەر قوربانە کەم
رۆژو شـــەو شـــادیم نـــەماوە عـــاجز و وێرانـــە مـــاڵ
وا لەدەست غەم دەربەدەر بووم سـینە ریـش و دڵ بـەتاڵ
بوومە جێی لۆمەی هەمووکەس بێکەس و ئاشفتە حـاڵ
وەختی ئیستیمدادە ئەمجا چونکە مـاوم بـێ مـەجال
بـۆ دڵـی خـۆمی برینـدار ئیلتیجـای دەرمانەکـەم

وەك ( فلاتنهـر ) کـە هـاتووە بـۆ ئیجابـەی سـائیلان
سـائیلێکی بـێ نـەوام ئـەی پادشـاهی عـادیلان
هاتمە ژێر دامێنـی عـەفوت مـن بـە وێنـەی قـاتیلان
گـەرنەکەی رەحمێ بە حالّم دەچمە ریـزی موفلیـسان
دائیما دڵ پڕ لە شەڕو فیکری چەند عیسیانە کـەم
نـا ئومێـد رۆیـن لـە قاپیـت لام مەحاڵـە بـێ درۆ
بێ حـەیا و شـەرم و شـەکیبی پـێم دەنووسـێ گفتگـۆ
سـەد دەرم کـەی نـاعیلاجم دێمـەوە خزمـەت ئـەتۆ
لوتف فەرموو بەڵکو ( عاصی ) رێی ببێ بۆ ئاموشۆ
خـاکـی بەرپێـت بۆ تـەداوی من لە سەرچاوانەکەم

❊ ❊ ❊

(٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

سەیری تەییارەی ئەجەل کەن هاتووە بۆ غارەتم
دایە بەر سارووخی عیللەت ناو دەروون و قامەتم
چەند بینای تێك دا لە جیسمم ، مەرکەزی سەد ئافەتم
هەندە مەحزوون و رەزیل و غەمزەدەو بێ تاقەتم
بۆیە دائیم رووت و قووت و بێ زەخیرەی قیامەتم

عومری گەنجیم چوو لەدەست و جوست و جۆییێکم نەکرد
قەت لە بۆ سولحانی نەفسم گفتۆگۆییێکم نەکرد
بۆ تەداوی لای حەکیمان ئاموشۆییێکم نەکرد
هیچ لە بازاری شەبابی گردوکۆییێکم نەکرد
چونکە بێ مایەم ئەوێستا سەیری چەند بێ بابەتم

رووم بە جاریٚ کردە نووستن وا لە لێفەی غەفلەتا
وام دەزانی دین و دونیا وا لە قەبزەی سەروەتا
تا ئەسیر بووم وا بە جاریٚ من لە داوی نەکبەتا
دڵ بە سەرما هەردەگریا چت لە من کرد حەسرەتا
من مەکینەی زیکرو فیکرم بۆ شکاندت ئالەتم

کۆششم زۆر کرد لە دونیا تاکو مەقسەد چوو لە دەست
دائیما وەك وێڵ و وەحشی بێ شعوور و شێوە مەست
دێوی نەفسم بووە رەئیسم مەرکەزی دڵمی دەبەست
هێند نەفام بوم دەفعەیێکی بۆ دیفاع پشتم نەبەست
تازە فیکرم کرد و زانیم زالم و بێ مروەتم

حاڵی حازر وەك قەدیمم هەر ئەسیری دەست هەوام
ڕاستە عومرم گەییە ئاخیر زیاد لە جاران بێ حەیام
هەند حەریس و بێ دەماغم غەرقی ناوگێژی ریام
واکەمەر بەستەی ئیتاعەی نەفس و شەیتان بووم مودام
بۆیە ئێستاش وەك منالێم غەفڵەتە هەر عادەتم

یەك بەیەك گۆڕاوە ڕەنگی حوسنی سەر لەوحەی جەماڵ
بەسیە غەفڵەت وابەجێ مای تابەکەی ئەی بێ کەماڵ
بابە قەسوەت رەش نەبێتن ڕەنگی سوورت وەك زوخاڵ
عومرەکەم گەییە نیهایەت بێ ئۆمید ماوم لە ساڵ
رۆژ بە رۆژ هەرچاوە نۆڕی چەند دەقیقەو ساعەتم

یا ئیلاهی نەبووە نابێ غەیری تۆ بە خودا خودا
هەم لە سایەی فەخری عالەم وام لە سەرجادەی هودا
ئایەتی ( لاتقنطوا ) شم بۆ نەجات بۆتە پەنا
ئیلتجاشم بردە قاپی حەزرەتی شاهی عەلا
مین بەعد هەر ئینتیزاری مەوجی دەریای رەحمەتم

حەمـــدولیللا نەقـــدی ئیمـــان بـــۆ قیامـــەت مایەمـــە
خـــۆم بـــە شاهنـــشا دەزانم ئومـــەتی ئـــەو شـــایەمە
چیم لـــە دارایـــی جیهانـــە عەبـــدی ئـــەو جێگایـــە مـــە

نامەوێ ناوبانگ و شوهرەت حیفزی ئیمان غایەمـــە
شـــــاهی من وەختی سەفەرمە بۆ حیسابی قیامەتم

مـــن بـــە پـــیری هاتمـــە دەرگـــەت پـــیری پیرانـــی جیهـــان
چـــونکە مەعلوومـــــە دەزانم ئێرەیـــــە دارولئـــــەمان
دەستی من دامانی تـــۆ بـــێ ئـــەی شەهنـــشاهی جیهـــان

نـــائیبـــی فەخـــری ریسالەت جێ نیشی قوتبەکان
گەر نییە ئیمدادی ( عاصی ) زۆر شڕە من حاڵەتم

* * *

## (١٠)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

غـەم هـات و فـەرەح رۆیـی وو ئێـستاکە حـەزینم
بـاوەڕ مەکـە بـەو ژیانـە کـە ئـەو یـارە نـەبینم
تەئـسیری شـەڕی کـردووە هیجرانـی لـە دیـنم
مەشـهوورە لـە ئافـاقی جیهـان ئـاهویی چـینم
تـەعقیبی دڵـی کـردووە وەك دوژمنـی خـوینم
بـێ هوودەیـە وا دەرچـو کـە ئـەم جارە لـە چارە
ئەگریجـە لـە گـەڵ پەرچـەمی وا بوونـە سـەیارە
رەشمـاری دوزوڵفـی وەکـو سـێدارە لـە دارە
مەقسوودی لە سـەر کوشـتنی مـن بـوو بـە قـەنارە
فەوتـی سـەرە ئـەم دەفعـە وەکـوو چـاوی دەبیـنم
تەقدیری ئـەزەل وایـە کـە لـەم رووحـەی بـەری بم
خـوێنم بـڕژێ شـاهیدە بـۆ رۆژی حەسـیبم
هەرچـەندە کـە بێـچارەوو دامـاوو غـەریبم
فەخرێکـە لـە ئـەم جێژنـە کـە قوربـانی سـەری بم
ئـەو خـوێنـە بڕێـژێ بـە دڵ و جـەرگ و بـرینم

وەك وەعــدی ویــسالی لــە ئــەمن كــردووە تــەئخیر
تــەحریكی رەقیبــی ســەگە لێــی كــردووە تەئــسیر
چەند دەفعە كە عــەیبی منــی بــۆ كــردووە تــەقریر
شمــشیری بــرۆی عالــەمی پــێ كــردووە تەســخیر
رەحمــی نییــە یــــەك جــاری بــە گریــان و گــرینم

ســەد نــاوی خــودا بــێ لــە قــەدو سینەیی باغــت
مەفتوونــە لــە گــوڵزار و چــەمەن لالــە لــە داغــت
یــــارەببی نەشــێوێ هـــەوەس و زەوق و دەماغـــت
جــارێكی بــە لەنجــە وەرە بــۆ ســەیری نەســاغت
تـــا ســـەروی قەدوگوڵـــشەن وگـــوڵزاری ببینـــم

وەك زوهــرە لــە مەتلــەع ســەری هێناوەتــە دەر[1]
وا مـــشتەری دڵ قیمـــەتی خـــۆی ناوەتـــە ســـەر
رووحـــی وەكـــوو دەســـتمایە ئـــەوا نـــاوە تەبـــەر
چەند كەس لە سەر ئەم رێیە دەبینم كە بە بــێ ســەر
مەعلــوومە كــە ئەو دەردە منیــش وەختــە ببینــم

---

(١) ئەم لەتە و دوو لەتی دوای ئەمە،تەفعیلەی كۆتاییان لە كێشەكە جیایــە.لــەباتی(فعــولن) بۆتــە (فعل).واتە تەفعیلەی كۆتاییان لەباتی (مــەحزووف)،(مــەجبووب)ــە.

دێوانـــەیی دڵ دەســـتی کـــە کـــردووە بەرەقاســـی
لام شـــێتییە لـــەم بەزمـــە چـــە ئومێـــدی خەلاســـی
هاتۆتـــە ســـەر ئـــەم گێـــژە بـــە عینـــوانی غەواســـی
ئەم بەندەیە لەم عەسرە کە مەشهوورە بە (عاصـی )
بێهـۆشـــە دڵـی مــن لــە جەفـای وەســـڵی ئـەمینم

* * *

## (۱۱)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەقسوور)

ئـــاوارە لـــە ســـەحرایی غـــەم و بـــێ ســـەروپا خـــۆم
ســـەرتا بـــە قـــەدەم غەرقـــە لـــە تۆفـــانی بـــەڵا خـــۆم
مەبغوورزی موحیبب و هـــەموو ئـــەرباب و بـــرا خـــۆم
لـــەم عەســـرە کە خنکاوی غەم و بەختی سیا خـــۆم
بێ بەش لە هەموو شادی یو هەم سەیرو سەفا خـــۆم

حـــەیرانم و سەرئاســـیمە بـــێ هـــۆش وحەواســـم
دائـــیم غەمـــە خـــۆراکم و خوونینـــە لیباســـم
بـــێ ئـــاگرە ســـووتانی دڵ وجـــەرگی پەلاســـم
رووزەردو ســـەرەفگەنـــدەیی دیـــداری خەواســـم
ئەی تـــابیعی ئـــەفعالی شـــەڕو نـــەفس و هـــەوا خـــۆم

مـــەنعم مەکـــەن ئیمڕۆکـــە لـــە نـــاڵان و گـــرینم
بـــێ فیکـــری عیلاجـــە جگـــەرو ئێـــشی بـــرینم
لام پەشمـــە ئەرەســـتۆ ئەگـــەر ئـــەو یـــارە نـــەبینم
موشـــتاقی دەری حـــەزرتی شـــەهـــسواری ئـــەمینم
بێگانە لە عەقڵ و شـــەرەف و هـــۆش و بـــەها خـــۆم

بێهوودەیـــە بـــۆ دەردی ئـــەمن فیکـــری تـــەبیبان
لەتلـەت بـووە جـەرگم بـە جـەفای تـیری ڕەقیبـان
چـــارەی نییـــە گریـــانی دڵ و چـــاوی غـــەریبان
دڵ ڕۆیـوە لۆمـەم مەکـەن ئـەی یـــارو حـەبیبان
دووچـاری غـەم و غوربـەت وگریـان و جـەفا خـۆم
کون کون بووە جەرگم بـە جـەفای تـیری مەلامـەت
کەوتوومەتـە گێـژاوی غـــەم و بـەحری نەدامـــەت
لوتفێ بکە لەم مەوجـە کـە دەرچـم بـە سـەلامەت
ڕســـــواوو پەرێشـــــانم و تـــــا ڕۆژی قیامـــەت
بەدناوی ڕەقیبی سـەگ و بـێ شـەرت و وەفـا خـۆم
گرتوویـــە تـــەمی حەســرەت و دڵ بۆتـــە دەماوەنـد
بەحسی منـە بـۆ خـاس و عـەوام بۆتـە زەماوەنـد
میحنـــەت دڵـــی داگـــرتم ولێـــی بۆتـــە قەڵابەنـد
شادی لە منی خەستە بـەبێ فلـس و بـەها سـەند
بێ عەقڵ وشـعوور دەربـەدەری دەشـت و چیـا خـۆم
ڕەحمـــێ بکـــە توخـــدا بـــە منـــی خەســـتەوو بریـــان
دیـــدەم هـــەمو فـــەوتاوە لەبـــەر جۆشـــشی گریـــان
مەئویـسە لـــە لـــوتفی هـــەمو ئـــەرباب و ڕەفیقـــان
( عـــــاصی ) م و پەراگەنـدەوو دڵـزار و پەرێـشان
شەرمەندەوو دامـــاوو غـــەریب غـەرقی خـەتا خـۆم

❊ ❊ ❊

(١٢)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەكفووفی مەقسوور)

وەك خوێنە سرشكم لە غەم و میحنەت و هیجران
بۆ شەمعی جەمالت وەكو پەروانە لە سووتان
پەروام نییە باوەڕ بكە ئەم جارە بە قوربان
لوتفێ بكە بەم حاڵەتە ئەی حەزرەتی سولتان
سندووقی سەری خۆشت و هەم خالیدو عوسمان

سەرگەشتە لە دونیا وەكو سەرخۆش و نەخۆشم
بێگانە لە عەقڵ و شەرەف و شادی یو هۆشم
خوێناوی جگەرمە بەدڵی خەستە دەنۆشم
هەرچەندە هەتیونیم و وەڵێ سینە بە جۆشم
قورئانە دەفەرموێ مەكە قەت قەهری یەتیمان

مەعلووم بووە قوربان لە خەواس و لە عەواما
كەمتر نییە لەم دەرگەیە هەرگیز لە غولاما
شادی بكە ئەم بەندەیە جارێ لە پەیا ما
دڵ سابیتە لەم قاپییە قوربان لە دەواما
ساتۆش بكە رەحمێ بە دڵ و دیدەیی گریان

لەم قاپییە دەست کەوتووە وا جەوهەری تەسکین
مومکین نییە بڕوا لە دەرت عاجز و غەمگین
فەزل و شەرەف و عەقڵی ئەتۆ نایەتە تەخمین
لوتفی حەقە لەم رەمزە کە تۆی کردووە تەحسین
سەرداری هەموو مورشید و هەم غەوسی مریدان

گەرتالیبی رێگایی حەق و دەرکی سەوابی
یا نائیلی ئەلتافی حەق و رەحمی خودا بی
یا ئەهلی نەجاتی غەم و هەم رۆژی جەزابی
مەحسووبی دەری حەزرەتی سولتانی عەلابی
مەحفووزی لە نەفس و شەڕ و هەم ئافەتی شەیتان

هەرکەس دەیەوێ جەننەت و هەم خولدی موعەتتەر
دەست ناکەوێ بیللاهی بە بێ شەرعی موتەههەر
کردوویەتە خادیم لە ئەزەل سەبقی موقەددەر
باوەڕبکە ئەم شاهە کە قوتبێکە مونەووەر
پشتێنی بە دەست بگرەو و دامانی بەدندان

ئەم پیرە کە دەستگیرە بەرەفتاری شەریعەت
لێی دەست دەکەوێ نیعمەت و ئەسراری تەریقەت
ئەو جێگەیی پڕنوورە بە ئەنواری حەقیقەت
سەرفی بکە لەم وەسفە تو ئەفکاری عەمیقەت
مەشهوورە کە (عاصی) بووە شاگردی ئەدیبان

## (١٣)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەقسوور)

هەرکەس دەیەوێ عیززەت و هەم عیسمەتی ئیمان
یا تالیبە بۆ پەیڕەوی سەر جوملەیی قورئان
یا مەقسەدی حیفزی دڵە ئیمڕۆکە لە شەیتان
یا شەوقی دڵی غالیبە بۆ حۆری یو غیلمان
با بگری بە دەست دامەنی پاکی شەهی عوسمان

خۆش تەبع و دەلیلێکە لە مەیدانی نەجاتا
چەند موشفیقە ئەو زاتە لەهەنگامی حەیاتا
سەر دەفتەری ئەو سەبتە لە دیوانی سەباتا
لات حازرە بۆ حیفزی لە جەولانی مەماتا
تۆش بگرە بە دەست دامەنی پاکی شەهی عوسمان

زاتێکە کە سەرحەڵقەیی پیرانی زەمانە
دورڕێکە لە سەرگەنجی شەهنشاهی جیهانە
مەئزوونە لەلای زاتێ کە سوڵتانی جیهانە
یەعنی لە تەرەف شاهی عەلا غەوسی زەمانە
زوو بگرە بە دەست دامەنی پاکی شەهی عوسمان

شـــۆخێکه کـِـه هاونــاوی شەهنـــشاهی ســـیراجدین
نووریکـــــه لـــه ئاســـــاری فیـــــووزاتی بـــــەهادین
غونـــچێکه لـــه گـــوڵزاری کـــه رامـــاتی زیـــادین
ســــــەروێکه لــه ژێــر تەربییــەتی شــاهی عــەلادین
بێ بگــره بەدەســت دامــەنی پــاکی شــەهی عوسمــان

(عاصــی ) م وپەراگەنـــدەوو مـــەحزوون و غـــەریبم
بـــێ عیـــزەت و بـــێ بـــەهرەوو بـــێ فـــەیزو نەســیبم
لـــەم زوڵمـــەتی دووری کـــه بـــەبێ نـــوورو شـــەکیبم
رەحمـــێ بکـــە ئـــەی رۆشـــــنی دیــوانی حەســیبم
دڵ بگری به دەست دامــەنی پــاکی شــەهی عوسمــان

* * *

## (١٤)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفوفی مەحزووف)

مـــەحوی ســـتەمی جـــەوری رەقیبانـــە دڵـــی مـــن
مـــەجنوونی پەراگەنـــدەیی هەردانـــە دڵـــی مـــن
ســـەرفی گوهـــەری عـــومری لـــە گریانـــە دڵـــی مـــن
ئامـــــاجی مـــــوژەی تیـــــری جەوانانـــە دڵـــی مـــن
حەبـــسی چـــەمەنی چـــاهی زەنەخدانـــە دڵـــی مـــن

پابەســـتە بـــەدوو زوڵفـــی رەشـــی شـــێوە فـــەرەنگم
کـــــوژراوو جگـــــەر پـــــارەیی پـــــەیکانی خـــــەدەنگم
نێـــچیری کەمەنـــدی شـــەهی جەمـــشید و پەشـــەنگم
هـــاوارە کـــە شـــەیتانی حەســـوود هاتـــەوە جـــەنگم
تـــرســـــم زەرەری مایـــەیی ئیمانـــە دڵـــی مـــن[1]

بێ مەی یو مەییخانـــە بـــە دائـــیم وەکـــو ســـەرخۆش
کەوتوومەتە بن کێوی مـــەراق بـــێ دڵ و بـــێ هـــۆش
داماوو ســـەرئەفگەندەو و هـــەم ســـینەمە پـــڕ جـــۆش
دوو دیـــدەیی مەســـتی ئـــەوە کردوومییـــە مـــەینۆش
خنکـــاوی شـــەپۆلی یـــەمی عومانـــە دڵـــی مـــن

[1] لە دەستنووسییێکی دیکەدا نووسراوە: ( ترسی ).

بێ حەللی قەزییەی لە میسال عاجزە تووسی
لاری غەلەتی حاشیە لە قازی کە دەنووسی
پەروانە بە شەمعی روخی ئەوبوو بە مەجووسی
تالانی سەروماڵمە ئەم جارە بە لووسی
فیکری عەبەسی قازییە حەیرانە دڵی من

نەققاشی ئەزەل نەقشی برۆی کردووە تەرجیح
حەل نابی بەسەدمانی یو هەم جەدوەلی تەشریح
گوێ بگرە لە ئەم فیکرە تو ئەی تالیبی تەوزیح
حاشا لەجبە وخەرقە وو سەددانەیی تەسبیح
تالیب بەمەی وبادەیی مەستانە دڵی من

مەجنوونە دڵی خەستە لەسەرکێوی جەفایە
بۆ خاڵی وەکوو لەیلە کەبێ زەوق و سەفاییە
کوژراوی گوڵەی عیشقە کە دووچاری هەوایە[1]
لەم دەرگەیە چەند ساڵە کە پابەندی وەفایە
دائیم بە تەمای هاتنی دەرمانە دڵی من

---

[1] لە دەستنووسێکی دیکەدا لە جیاتی ( گولەی)، نووسراوە ( غەمی ).

وا گۆشەنشینی قەفەسی سینەمە بێ کەس
زامارە بە پەیکانی دو ئەبرۆیی موقەووەس
لێی ناگەڕێ بەدبەختی رەقیبم وەکو حەسحەس[1]
خۆراکی لە خوێنی جگەری ( عاصی ) یە خۆ بەس
لەو حوجرە کە پڕ میحنەتە پەنهانە دڵی من

* * *

[1] لە دوا دەستنووسدا لە جیاتی: ( وەکوو حەسحەس ) کە لە دەستنووسەکانی دیکەدا هاتووە، نووسراوە ( بەهەوەس )، بەڵام لە بەرئەوەی بە گوێرەی کێشەکە ( وەکوو حەسحەس) راستترە ئەوەمان دانا.

## (١٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

عاسیمەی سولْتانی زەوقە شاری کۆ بۆهەمنشین
بۆ عولووم وعەقلْ و عیرفان بۆتە یەککەم شانشین
حەمدو شوکری پێ دەوێتن لازمە غافلْ نەبین
شوکری لوتفی خوا بکەین و قەت لە ئەمری دەرنەچین
ئەم مەقامەی دابە ئێمە گولْشەنە بۆ عیلم ودین

ئاوی وەك ئاوی حەیاتە وەك بەهەشتە بۆ حەیات
هەر وەکوو شاران زەمانە خزمەتێکی گەر بکات
تاجی فەخرە شاری کۆیە بۆ جنوب و ڕۆژهەلاّت
باغ و میوەی شوبهی جەننەت گیایەکانی بۆن ئەدات
نێرگس و لالەو بنەوشە سەف بەسەف هەم چین بە چین

زۆر مەراقمە تاکو ماوم سەیری ئەورووپپا بکەم
تا لەخۆشی و وەزعی شاران دیققەتێکی چا بکەم
ئایا وەك کۆیە دەبینم تا ئەویش ئیفشا بکەم
گەر بە چاوی خۆم نەبینم زەحمەتە بڕوا بکەم
وەسفی جوغرافی دەلیلە شاری کۆیە یەککەمین

هـــەر فنـــوونیٚ لیـــی دەپرســـی ئـــەهلی ئـــەو لیٚبوونـــەوە
یەك بەیەك لەم شوومی جەهلە خاس و عام جویٚ بوونـــەوە
وەك قـــەدیم گـــولزاری عیلمـــی زۆرگـــولّی گرتوونـــەوە
هـــەروەکوو غیلمـــان و حـــووری نەوجـــەوان کۆبوونـــەوە
وا لـــەناو باغـــاتی عیرفـــان بـــوو عولـــووم وگولـــچنین

شـــوکرولیللا ئـــەهلی کۆیـــە بوونـــە یەککـــەم بـــەهرەوەر
لایـــەقی هەرنەوعـــە مـــەدحن شـــارو چیاوودەشـــت ودەر
ئەهلی فەزل و ئەهلی غیرەت حەقپەرســت و بـــا خەبـــەر
شیٚری مەستن بۆ شـــوجاعەت چـــاونەترس و پـــڕ هونـــەر
مەزرەعـــــەی ئەوسافی زەوقیان لایقـــە بـــۆ خۆشەچـــین

گەرنیهایـــەت خـــواهی وەســـفی زەحمەتـــە قـــەت نـــادریٚ
چونکە مەدحی شاروئەهلی قەت بـــەهیچ کـــەس نـــاکریٚ
ئـــەهلی دیققـــەت بیٚتـــە کۆیـــە فیکـــری خـــۆی بـــاراگریٚ
تا بەچەرخی حیرەت و غـــەم جـــەرگ و ریـــشەی بـــا دریٚ
جیٚـــی وەهای چونکە نەدیوە قەت لـــە ئـــەقتاری زەمـــین

گـــەر جەبـــەل لبنـــان ببیـــنم بـــیٚ شـــك ئایـــاغی دەکـــەم
هەر بەسەرچاوەی حەمامۆك جەرگی ئەو مـــن داغەکـــەم
سوبح وشام بۆ کەیف و شادی ســـەیری ناوبـــاغی دەکـــەم
زۆر بـــە مـــەدحی لیٚوەشـــاوە بـــەرزو پـــەڕ لاغـــی دەکـــەم
لایقە بۆ شاری کۆیـــە پیٚـــی بلیٚـــــن خولـــــدی بـــەرین

من کە کۆیەم سەیری من کەن قەسرو باغ و پەنجەرەم
سەیری کەن لەم لالەزارو ئەم هەوا رووحپە روەرەم
بێت و لبنان من ببینێ بێ شکە دەگرێ وەرەم
من موغازەی زەوق و شادیم ئەو دەبێتە دێوەرەم
بابەتی زەوقی دەوێتن تاکو بفرۆشێ لە چین

فەسڵی زستان کۆچی کردو خیوەتی هەڵدا بەهار
مەنزەرەی شادی و سرووره دەشت و چیاوو دێمەکار
وەك بەهەشت رازانەوە هەرچار تەرەفمان لالەزار
(عاصی) یا بێرە تەماشا و نووکی خامەت بێنەکار
هەر لە سەد یەك وەسفی دەرخە بێ وەفا با دەرنەچین

❊ ❊ ❊

(١)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

# تەخمیسی غەزەلی ئەحمەد ئاژگەیی
# لە مەدحی جەنابی مەلا محەممەد جەلیزادە

ببینە مەزهەری حیکمەت لە عەرسەی دیققەتا سوارە
لە بەرقی تیژی فیکری ئەو مەسائیل جوملە وا دیارە
سەفایی سینەیی شەرحی مەقامی سرڕوئەسرارە
لە تەعقیبی حەقیقەتداکەسێ دانایی ئەسرارە
لە ناحەق لا بە حەق مولحەق حەقایق بین و بێدارە

تە ماشای لەوحی قەلبی کەن بیحەمدیللا کە مەشغووفە
لە گەڵ ئەسراری قورئانی بە دائیم فکری مەئلووفە
بیحەمدیللا لە ئەفلاکا وەها مەعرووف و مەوسووفە
لەواقیفدا کە تەوقیفە بە وەقفی وەقفە مەوقووفە
قەفایی قیف قیفی قافی بە قافی قووە دەووارە

بەبێ جوهد و مەشەققەت بوو وسوولی عیلمی مەئموولی
ئەوا سەبتە خەتی قودرەت لە ناو دیوانی مەقبوولی
موتەهەر تاهیرو ئەتهەر لە ژەنگ و تۆزی مەشغوولی
بە جوهدی حاسیل و تەحسیل و ئیستیحسالی مەحسوولی
حوسوولی حەوسەلەی حاسیل بە ئەسلی ماحەسەل دیارە

لەیومنی مەقدەمی ئەودا زەمین حەقیەکە مننەت کا
بە سەر ئاسمانی هەفتەمدا ئەویش ئیقراری عیززەت کا
چەجیگای حیرەتە زاهید کە کەسبی عەقڵ و هیممەت کا
مودەققیق با لە دارولیفکری دەقوولبابی دیققەت کا
بە تەدقیقی دەقایق دەق دەزانێ کۆیە ئەم شارە

خەزێنەی عیلمە خۆسینەی هووەیدایە موفیداتی
لەبەحری عیلمی وا دیارە وەکوو گەوهەر کەلیماتی
درەخشانی لەبەر مەعنا خوتووتی سەرسەحیفاتی
دەفینەی نەقدە نەقدینەی نەقیداتی نەقیزاتی
مەلامەوسوومی مەرسوومە لە سەر ڕێی فەخری موختارە

لە مەعنادا کەلامی ئەو هەموو تەلتیف و هەم میلقە
یەقینە پەیڕەوی قەولی بەجارێ مووجیبی عیتقە
بە قووەی عیلمی فارووقە موقیتی باتیل و فیسقە

به تەسدیقاتی سددیقی سەداقەت مەسدەقی سیدقە
خەتیبی خوتبە خیتابی خەتیبی ئەمری غەففارە

چووە ناو بەحری عیلم و دوڕڕی مەعنایی دەرێناوە
هەیولای فیکری خۆدیارە ئیحاتەی عیلمی واداوە
سیراجی مەزهەبی ئیسلام جەلیزادە ئەواماوە

لە زینوورەوینەوە نووری حەیا چاوەی ئەوا ماوە
چرای مەجمووعی جەمعانە جەماعەت نەقشی پەڕگارە

لە ولکەی میللەتی ئیسلام قبوولّیان کرد بە مەخدوومی
ئیمامی ئەهلی عیلمە ئەو هەموو رازین بە مەئمورمی
لە فەهمی جارییە رەمزی هەموو عیلمێك بە مەنزوومی

لە عیلمی حەزرەتی عەلیە ویلایاتی بە مەعلوومی
شەرایع شاریع و مەشرووع شرووعی روزی ئیزهارە

ئیلاهی ئەم جەلیزادە دلّی دوور بێ لە گەردی غەم
تەلەب دەکرێ تەسیحەی حەق بە مەعلوومی ئەوێستا لەم
قراری حەققی هەرچاری لە فەهمی بوون ئەوێستاجەم

ئەئیممەی ئەربەعە هەریەك لە سەر روبعی ئەوێستا ئەم
وەلی عەهدی هەموویانە محەممەد یاری هەرچارە

له گەردوونی حەقیقەتدا وەکــوو کــەو مەرکــەبی رانــی
خــەیاڵاتی موفیــدو هــەم فونــوونی مەزهــەبی زانــی
جودای حەققی لە باتیل کـرد مــەفادو مەتڵــەبی زانــی
لە کـۆکـۆکـۆن وەکوو کۆنە کەواکیب مــەوکیبی زانــی
بە تــوولی عــومری عەمروزەیــد شــوکرگفتاری ئــەخبارە

حەتا ئاسمان لە دەورا بێ ئیلاهــی هــەر عەلامــەت بــێ
لە تاریکی شەوی جــەهلا چـرای دەفعــی زەلامــەت بــێ
موقەووی دینی ئیسلام و شەهی ئەهلی عەمامەت بــێ
ئیلاهـــی تا لە دونیا زەید و عەمری بێ سەلامەت بــێ
ئەیا مەسعوودی ئیبن ولحاج کە بۆ دین مەرجــەعی کــارە

ئیلاهی عەفوو فەرموو تــۆ کــە ئێمــە ئــەهلی ئیمــانین
لە سەر وەعدەی حەقی خۆتە بە هیــوای حووروغیلمــانین
هەزار (عــاصی) وەکوو مـن بێ لە سایەی رەحمی رەحمانین
بە حوکمی عیلم و حیلمی سەبرو شوکری ئەو موسلمانین
وەئیللا جاهیــلی وەك ( ئاشـــگەیی ) گومرایە بێــچارە

*   *   *

(٢)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

## (تەخمیسی غەزەلی وەفایی)

یاران چە عەجەب دەوری قەمەر وەك شەوی تارە
وامەوسیمی گولزارو گوڵ و گەشتی مەزارە
وەختی هەوەسی بولبولە وا بەختی بەکارە
ڕۆژی تەرەب و فەسلی گوڵ و ڕوویی بەهارە
یاران گوڵەکەم کوا کەدەمی بۆس و کەنارە

نەشئێکە لە جلوەی روخی تۆ حوسنی زولێخا
شەیدا سیفەتی عیشوەیی تۆن وامیق و عەزرا
وارەونەقی بەخشیوە بە گوڵ قامەتی رەعنا
گوڵ نارە بەدەم سوورەتی غیلمان قەدی توبا
گۆشەی چەمەن و ڕوویی گوڵ و پایی چنارە

زاهیدە ئەگەر وەربگەڕێ قەت مەکە لۆمەی
تاوس نییە نەقشی چ لە راست گوڵگوڵی سوخمەی
وەك زولمەتە دونیا کە لە داخستنی دوگمەی
بنوارە لە ناو حەڵقەیی زوڵفی سەری کوڵمەی
دوو ڕۆژی دەرەخشانە لە ناو دووشەوی تارە

دەڕوا لــــە دڵـــم خەســـرەوی شـــیرینی چـــەلەنگم
بێ باکە لـەمن ئـەو کـە دەڵێـی قـەومی فـەڕەنگم
بـــەرتیری مـــوژەی داوە دڵـــم ، دڵبـــەری شـــەنگم
بۆچی نـەگریم کوشـتەیي سـەد غـەمزە خـەدەنگم
مـــن ئێـــك و نیـــزامی حەبەشــــی زادە هـــەزارە
مـــەمکوژە بـــە ئـەم دەردەوە هـــەردەم بـــە نـــەوایێ
پێوەنـد مەکـە ئـەم بەندەیـە هـەردەم بـە هـەوایێ
فتـــوا مـــەدە بـــۆ کوشـتنی هـــەردەم بـــە خـــەتایێ
بەو زولف و موژە مـەمکوژە هـەردەم بـە جـەفایێ
جارێـــك لە تەنـافم مـــەدە جـارێـــك لـــە قنـــــارە
تەشبیه بکەن ئەرقامـــەتی تـۆ بـــە حـەنەسـەهوون
شـــەیدایی ئـــەتۆ کـــەبکی خـــەرامان و تـــەزەڕڕوون
سەرئاسیمە لەو قامەتـە سـەد عەرعــەرو سـەروون
زولـف و روخ وپوسـتانی قــەدی نەوبـەری سـەروون
ئـــەو عەترە بـەزاهیـــر گـــوڵ و نـــارنـــج وئـەنارە
بـــۆ وەســـڵی جـــەمالی تـــووە لـــەم میحنەتـــە ئـــالاّم
مـــــەجنوونم و سەرئاســـیمەوو کوشـــتەیی لـــەیلام
لەو گوڵـشەنە عاشـیق بـە گـوڵ و ســونبول و لالام
بـــەو قامەتـــە رەعنایـــە شـــکۆفەی قـــەدوبالاّم
قـــەد نـــارەوەن و بـــاغی گـــولاّن بـــاغی ئـــەنارە

هەردەم بــە تــەمای رەونــەقی ســونبول کــە دەنــاڵێ
وەك بولبــولی شــەیدا بــە هــەوای گــوڵ کــە دەنــاڵێ
لۆمەی مەکە ( عاصی ) بە هەموو دەم کە دەنــاڵێ

هــەر لــەحزە وەفــایی وەکــو بولبــول کــە دەنــاڵێ
کــەس مــەنعی نــەکا عاشــقی گــوڵزاری بــەهارە

❊ ❊ ❊

(٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(ڕەمەلی هەشتی مەحزووف)

# تەخمیسی عاصی لە سەر غەزەلی سەید ئەحمەدی مولەققەب بە حوسێنی

بۆتــەداوی ئێــشی جــەرگت فورســەتە (عاصــی) وەرە
وا تــەبیبی دەردی بــاتین ئیمــڕۆ بــۆ خــۆی دوختــەرە
حاڵی خــۆتی بــۆ بــەیان کــە پێــی بڵــێ بــەو کیــشوەرە
وا بە غــەمزەی جــەرگی پــڕ خــوێن کــردووم ئــەم دڵبــەرە
نــووکی مــژگــانــی لــە بــۆ دڵ پــارە کــردن خەنجــەرە
ســەددی کــردووە ڕێــی ویــسالی دڵ ڕفێنــی مەستەچــەم
خواردنەوەم خوێناوی مەرگــە ، خواردنیــشم بۆتــە غــەم
مــن ســەرم دەرناچــی یــاران ڕوو لــە قــاپی کــێ بکــەم
تیری غەمزەی هەند بە تاوبۆم دێ لە دوویــەك دەم بــە دەم
ســەیری ســینەم کــەن لە هەرلا کــون کونە وەك پەنجــەرە

تۆ لە گوڵزاری جەمالی ( عاصی ) سەیری چی دەکەی
یادی وەختی نەوجەوانی و سەردەمی گەنجی دەکەی
بۆیە سککەی شاهی حوسنی دائیما تەرویجەکەی
بۆ موسەخخەرکردنی دڵ پەرچەم و ئەگریجەکەی
هێرشی هێنا دەڵێی تابوورو تیپی عەسکەرە

موبتەلای دەردی فیراقی دڵبەری شیرین زبان
ئێش ونێشی هەندە زۆرە جەرگ و دڵ هاتۆتەژان
ئاگرێ بەربووە دەروونم هەر دەسووتێ بێ وچان
دووکەڵی ئاهم دەچیتن دەم بە دەم بۆ ئاسمان
ئاگری دڵ زۆر بە تاوە سینە عەینی مەجمەرە

خەو لە چاوم ناکەویتن بەو شەوی دوورو درێژ
ئەشکی حەسرەت هەڵدەڕێژێ دائما وەك ئاوەڕێژ
من لە سەحرای دەردی دووری هەڵدەسووڕێم گێژ و وێژ
وا لە دەریای عیشقیا کەشتی وجودم کەوتە گێژ
دڵ لەناو ئەمواجی ئەم بەحرە میسالی لەنگەرە

هەندە بێ لوتفە لە گەڵ من مەیلی بۆ وەسڵی نییە
چاو دەگریە چارەیەك بۆ ئەشکی وەك سەیلی نییە
پێم دەڵێ ئەو هەرزەگۆیە هیممەتی قەولی نییە
هەندە مەغرورە بە لای من موتلەقا مەیلی نییە
من فەقیر و بێکەسم ئەو پادشاه وسەروەرە

من کە ( عاصی ) م حەمدولیللا پاك نیازو خۆش دڵـم
وا لــەناو باغــاتی نــەزما بولبــولێکی سەرچــڵم
هــەم لــە ســایەی شــیعرەکانم خــاوەنی چــەپکە گــوڵم
ئەی (حوسێنی) قەت مەپرســە ماجــەرای دەردی دڵــم [1]
گەر بە ئــەژماری[2] بنووســی[3] ســەد هــەزاران دەفتــەرە

(١٣٩٥)

* * *

(١) لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (ماجەرایی دەردی دڵ).
(٢)لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (گەر بە تەعدادی) .
(٣)لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (بنووسرێ).

(٤)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

# تەخمیسی غەزەلی وەفایی

ئـــەی قـــووەتی نوتقـــت هـــەمو تـــەبلیغ و بەلاغـــە
ئەی شەوقی دو چـەهرەت نـە موشـابیه بـە چـراغە
ئـــەی سـێوی دوکوڵمـت نەمناسـب بـە مەراغـە[1]
ئـــەی پرتـــەوی حوســـنت هەمـــەرەنگی گوڵەباغـــە
نەشـــئەو نـــەزەرت شـــەوقی دڵ و زەوقـــی دەماغـــە

حوببـــت لـــە دڵـــم ســـابیتە مەڕوانـــە وجـــوودم
بـــۆ روتبـــەیی خاســـانی[2] دەرت نیمـــە وجـــودم
بەو لوتفـە کـە کـردت هەمـە دەم وا لـە سـجوودم
ئەســـماء و ســـیفاتت بـــە تەجـــەللی لـــە وجـــودم
شەو بـوو کـە توهـاتی لـە منـت کـردووە چـراغە

(١) لە دەستنووسێکی دیکەدا لەباتی(بە مەراغـە) نووسراوە (بە چەباغـە).
(٢)لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (چاکانی).

وەك هاتە تەماشام و کە هەستی ئەلەمی کرد[1]
دەر لەحزە بەسەد نەشئە کە سەوقی حەرەمی کرد
نەبزی دڵی وا گرتم و فیکری وەرەمی کرد
چەند نەشتەری غەمزەی لە دڵم داوو دەری کرد
قانوونی حەکیمانە بپرسین لەنەساغە

وەك هاتییە ناو دڵ دڵە سووتاوە لە تاوت
عالەم هەمو حەیرانەوو پابەستە بە داوت
بۆ روویی جیهان کافییە یەك نەشئە لە چاوت
تۆ هاتییە گوڵشەن لە بەرئەم زولفی بڵاوت
زۆر پێ نەچوو رۆیی لە چەمەن لالە لە داغە

تەسدیقە کە عالەم هەمو حەیرانە لە رازت
مەحموودە لە غەزنەینی جیهان مولکی حیجازت
چەند خۆشە کە دیار[2]بم لە نەزەر لوتفی ئەیازت
زولفت بە هەناسەم کە نەیا سینەیی بازت
زستانە گوڵستانەوو پابەستەیی زاغە

---

(١)لە دەستنووسێکی دیکەدا سێ لەتەکەی پێشەوەی ئەم پێنجینەیەی بەم جۆرە هێناوە:
بەو ئەمرە کە شمشێری برۆی هات و شەڕی کرد
سوڵتانی روخت بۆ منی بێچارە سەری کرد
چەند تیری موژەی بوو لە دوو قەوسەینی دەری کرد

(٢)لە پەراوێزدا لە جیاتی ( دیار ). نووسراوە ( سەگ ) .

رەحمێ بکە بەم خەستەوو بڕوانە گوڵی من
وەك بولبولی پڕزارە دەناڵێنی دڵی من
بۆ لوتفی ئەتۆیە کە سەفا خواهە دڵی من[1]

لەم ڕاستە کە بازاڕ چەنادەن بە دڵی من
هەر مەرحەمەتی تۆیە خەریداری ئەیاغە

دوو لەعلی دوڕئەفشانی[2] لەناو دوو سەفی زۆلفە
تەشبیهی بکەی بەدرە ، نەقانوونە ، نەعورفە
جلوەی نەزەری تۆیە لە ڕۆژابووە توحفە

ئەم کولمە کە ئارایشە سەد دائیرە زولفە
گوڵ شەوقی بە شەو داوە چراخانە لە باغە

شێواوو زەبوونم بێ مەی[3] و موتریب و ساقی
بێ هۆش و جنوونم وەرە ئەی ئولفەتی باقی[4]
بێ عەقڵ و فنونم وەرن ئەی موتریب وساقی

سووتاوە دەروونم وەرن ئەی موتریب و ساقی
بۆم لێدە لە تەمبوورەوو بۆم پڕکە ئەیاغە

---

(١) لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (بۆ لوتفی ئەتۆیە کە دەناڵێنێ دڵی من).
(٢) لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (دوو کولمی درەخشانی) .
(٣) لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (شێواوو زەبونم وەرن ئەی ...).
(٤) لە دەستنووسێکی دیکەدا نووسراوە: (... وەرن ئەی موتریب و ساقی).

( عاصی ) چییه تالیب بەنەی و زەوق و سەفایی
وا حازرە باجگر لە دەری عومری فەنایی
لەم خانە رەواجەکە دەڵێن روح بە هەوایی
چارەی نییە دێوانەیی رووی تۆیە ( وەفایی )
سەد دەفعە ئەگەر بیبەنە سەر پیرو وجاغە

* * *

(٥)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رەمەلی هەشتی مەحزووف)

# تەخمیسی عاصی
## لە سەر غەزەلی عەلی تەهرانی

یـــار ئـــەوا هاتـــە تەبەســـسوم غونـــچەیەکی نەودەمـــە
دڵ بـــە تـــاڵان چـــووی ســـوپاهی پەرچـــەم وئەگریجەمـــە
پێت بڵێم جانا لە سەرچـی مـــن کـــە حـــال ئاشـــوفتەمە
حەلقە حەلقەی زولفی یاری من هەمووی پێچ وخەمـــە
تـــا خـــەم و پێچـی دەبینم خواردنـــم پێـــچ و خەمـــە

ڕۆژی ئەووەل بوو کە زانـــیم مـــن بـــە غـــەم تێکـــەڵ ئـــەبم
موبتەلای دەردی گـــران و عیـــشقی بـــیٚ مەحـــسەل ئـــەبم
هـــەروەکوو پەروانـــە تووشـــی ســـووتنی مەشـــعەل ئـــەبم
وەك چـــرای کـــوڵمەی دەبینـــم من ســـــەراپا هـــەڵ ئـــەبم
شوعلەیی ڕووت کەم کە جانا بانەسووتێم بـــەو شـــەمە

دەفعـــەییٚ لـــوتفیٚ بفـــەرموو لابـــە بەنـــدی دوگمەکـــەت
بۆ تەماشای بـــاغی ســـینەت بۆتـــە پـــەردە ســـوخمەکەت
دڵ فیـــدایی لێـــوی ئـــاڵ و چـــاوەکەی پـــڕ ســـورمەکەت
زولفەکـــــانت لادە بـــــا دڵ بێتـــە بـــاغی کوڵمەکـــەت
ئـــاهویی وەحـــشی کـــە داوی دیـــت خـــەیاڵاتی ڕەمـــە

وەك لە دڵما غـەم بـە جـاریٚ بۆتـە هـەم دەم تـازە مـن
نامەویٚ تەختی فەرەیدوون جـام و هـەم جـەم تـازە مـن
چەم لە مەوجی بەحری بەسرابوویە لـەم لـەم تـازە مـن
نامـەویٚ ریگـای حیجازو چاهی زەمـزەم تـازە مـن
لە علی نابت زەمزەمی مـن تـاقی ئـەبرۆت قیبلەمـە
عیلمی عیشقت گـەر مەراقـە بێـرە سـەیری جـەدوەلی
سەرفی رووحە بۆ ویـسالت چاوەکەم خـۆ مەحـسـەلی
شەرتی عیشقت پیٚ نیشان دەم (عـاصی)یا هەر مەحمەلی
دین و دونیای خۆت لـە پێنـاو پێیەکـەی تـۆ ناعـەلی
هەرسەری هـەڵ نایـە ئێـستاکەش ئەوانـەی لا کەمـە

* * *

(٦)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

# تەخمیسی غەزەلی حەزرەتی زیائەدین ( قدس سره العزین) لە وەختی وەفاتی فەرموویەتی و نووسرایەوە

غـولام و دەوڵـەتم نـاوێ کـە مایـەی زەوقـی لەززەتمـە
شـەباب و شـەوکەتم نـاوێ کـە مـردن بـاری حەسـرەتمە
رەبـابی عوشـرەتم نـاوێ کـە وەختـی کووسـی رەحلەتمـە
کـولاهی سیـحەتم نـاوێ کە عیللـەت تاجی زیللەتمـە
کە وای عیززەت لە بەرناکەم کە قیللەت بەرگی رەحمەتمـە

لە شەوقی عـشقی سـولتانی بیحەمـدیللا سـەنا خـوانم
لـە رەمـزی ئـەمری سـوبحانی ئـەمن شـێواوو حـەیرانم
بـە حـوکمی زاتـی یـەزدانی پڕێـشان و پەرێـشـانم
لە عەیش و نۆشی حەیوانی ئـەمن چبکەم کـە ئینـسانم
خەیـاڵی بێ بەقا بۆ چـی کـە زیکـری نـارو جەننەتمـە

لە پێش خەلقی هەموو عالەم فەلەك ماوای نەبوو قـەتعا
لـە ژێرباری زەمین یاران سەمەك جێگەی نەبوو قەتـــعا
لە ناو خانەی عەدەمدا بوو مەلەك جێگەی نـەبوو قـەتعا
بەشـــەر ئەســـلا نەبوو ناوی مـەلەك ڕێگەی نـەبوو قـەتعا
لە عەرشی وەحدەتا وا بوو کە ڕەحمـەت جێـی مـەحەببەتمـە
عیبادەت بـۆ کەسـێ چـاکە خەبـەرداری شـەریعەت بـێ
سەعادەت بـۆ کەسـێ چـاکە تەریقـداری حەقیقـەت بـێ
نەدامـەت بـۆ کەسـێ چـاکە گرانبـاری زەمیمـەت بـێ
عـەیادەت بـۆ کەسـێ چـاکە گرفتـاری تەبیعـەت بـێ
کـەمن مـەفتوونی جانـانم چـە بـاکم دەرد وعیللەتمـە
ئەگـەر مەعـشوقە سـاقی بـێ بلـێ زەهـراوە بینۆشـە
بـە یـــادی وەسـلی دلـدارت وەری بگـرە تـو بینۆشـە
نەبێ باکت لە هیچ عالەم بلـێن مـەدهۆش و سەرخۆشـە
ئەگـــەر دلبـــەر بـــلاوێنێ هەمـــوو دەردو بـەلا خۆشـە
خودا ناکردە مەیلی نـا چـە فـەرقی سـەقم و سـیحەتمە
لە پـــایینم ئەجەل هات و دلی گـەزتم وەکـوو وەیبـــاب
لە دیدەی عومر جاری بوو سرشکی خوێن وەکوو سەیلاب
ڕژانـدی پیالـەیی ژیـنم بەسـەر جـەرگا وەکـوو زەهـراب
کە دیم خوێن جارییە ئیمرۆ لە جەرگ و دڵ وەکوو سـەیلاب
گـوتـم ئـەم شـاهیـدەم کافیـە حیسـابـاتـی قیامەتـمە

وەرە (عاصی) بە عەقڵی خۆت مەدە فتوای بەتاڵ هەرگیز
لە بـــۆ باری هەموو عالەم مەبە چارپای حەماڵ هەرگیز
خەریکی سیرەتی خۆت بە مەبە سەودای جەمال هــەرگیز
وەرە (فەوزی) لەفەهمی خۆت مەکە فیکری بەتاڵ هــەرگیز
ئــەوەی تــۆ تێدەگــەی قوربــان ئیــشاراتی لــە خیللەتمــە

*　　*　　*

(٧)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هەزەجی هەشتی تەواو)

# تەخمیسی حاجی مەلا زاهیر
# لە سەر غەزەلی مە لا عاصی

عەدالەت پیشە بوو شامیل لە بۆ هـەرکاری مـەردانـە
لە بەرچاپووك و چـالاكی فرانـدنی گـۆی لـە مـەیـدانا
خەسارەت بوو ئـەوا رۆیـی بـووە حەسـرەت لـە دڵمانـا
لـە دەنگـی ئەلویـداعی دڵ هـەموو عالـەم پەرێـشانە
لـــە هــەر لایـێ تەماشـاكەی سـەدای نـاڵین وگریانــە

چە راحەت بوو لە سایەی ئەو نەبوو ئەنواعی ئاشووبی
نەبوو خەوفت لە هەر وەقتێ لە بۆ هەر كاری تۆ چووبی
لـەپێ وو پـایی میرانـــی مـــساواتی بـەدی و خـووبی
هـەموو عالـەم لـە ناڵینـە وەكـوو نـاڵینی یـەعقووبی
دەڵـێن وا یووسـفی ئێمــە ئـیرادەی دەشـتی كەنعانــە

ئەوە مەحموودی هەمتایان خەجالەت ما لـە (واحمـرّت)
تەغیر بووی دەنگی بێ سایان لە تاوان گشتی (واصفرّت)

له وەختی کۆچ و ڕەحلەتدا وجوهیان گشتی (واسودّت)
دەڵێی چاوم لەتاوی ئەو گەیشتە حاڵی (وابیضّت)
بەتاوی ئاگری دووری هەموو هەرسینە بریانە

ئەوا مەخلووق هەموو وێستان دەکەن داستان ئەڵێن کوو بوو
تەحەممول پیشەوو موشفیق خیلافی وانی پێشوو بوو
قەبیلە و ئەهلی شارستان بەجوود و نیعمەتی پڕ بوو
عەجەب ئەخلاق و لوتفی ئەو بە عالەمدا کە شامیل بوو
لە ژێر سایەی ئەوا گشت کەس شموولی لوتف و ئیحسانە

حەبیب وخۆشەویستی مە لە ئێمە دابڕاوی تۆ
مەڵێن ڕۆیی بە یەکجاری بە یەکجاری لە هەر کوێی تۆ
لە هەرشوێنێ کە تۆی لێ بێ هەموو عالەم موتیعی تۆ
عەزیزی ئێمە بوو قوربان عەزیزێ بوو مەقامی تۆ
موبارەك بێ خودا حافیز ئەوەش هەر لوتفی ڕەحمانە

لە دەست مەدحی تووە خامە شەقی برد ئەلئەمان ئیمڕۆ
هەموو مەدداح و هەم شاعیر تەحەییورمان ئەلێن هەیڕۆ
ڕجایە (الحذر) (ظاهر) لە پێشی وەی بڵێی وەیڕۆ
لە ئەوسافی ئەوا(عاصی) کە فیکری قاسیرە ئیمڕۆ
زبانی لەنگ و ڕاوەستا خەریکی دەردی هیجرانە

❋ ❋ ❋

(٨)

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
(هەزەجی هەشتی ئەخرەبی
مەکفووفی مەحزووف)

## (تەخمیسی غەزەلی سافی)

سەیری کە لە ئەبرۆی چە عەجەب نەقشی کشایە
ئەم جەدوەلە بێ وێنە لە کرداری خودایە
چەند عاشیقی بێچارە کە بەوشیرە کوژایە
ئەی پرتەوی رەنگت بە مەسەل عەینی چرایە
وەی حەلقەیی زولفت شەبەهی داوی بەلایە

هەر سینەمە بێستون و بە شمشادی کوڵنگت
مولکی دڵە وێرانە لە بەر وەسڵی درەنگت
تابووری موژەهات و لە گەڵ زوڵفی فەڕەنگت
کردیانە نیشانەی سەری مژگانی خەدەنگت
بۆیە دڵەکەم بێ کەسە لەم گۆشە خزایە

ئەوماره لە گەڵ گەنجی جەمالت ئەبەدی بێ
زولمەت لە گەڵ ئەو ڕۆژەکە هەروا ئەبەدی بێ
لەو عاریزە وا پەرچەم و گیسوو ئەبەدی بێ
چۆن باوەڕە کافر لە جەهەننەم ئەبەدی بێ
وەك جەننەتی روخساری بە ئەو زوڵفە درایە

گـەر تـالیبی ژینـی مەچـوبەر شـەوقی جـەوانان
بێ شـەرت و وەفـابی مەچـو بـەر زەوقـی جـەوانان
بێ نەقـد و بـەهابی مەچـو بـەر عیـشقی جـەوانان
بـێ یـار و دەلیـل پامەنـە بـەر عیـشقی جـەوانان
چەنـد سەر لە سەر ئـەم رێیـە لـە سـێدارە درایـە

مە شهوورە لـە ئافـاقی جیهـان زاهیـدی خـود بـین
جێی سەجدەیە میحرابـی بـرۆ و عاشـقی غـەمگین
گەر تالیبی بۆ زولّفـی رەش و پەرچـەمی چـین چـین
بـڕوا نییـە ئەسـلا لەقـسەی زاهیـدی خـودبین
مەعلوومـە حـەیای عاشـقی بێـچارە رژایـە

رۆژێکـی دەگریـام و بـە عینـوانی وەفـایی
پـێم گـوت وەرە ئـەی شـۆخی جوانـانی هومـایی
دەرم کـە لەئـەم سـێبەرە دڵ کـانی عـەتایی
سـەوداسەری تـۆم مەحْـەرە زینـدانی جـودایی
سـندووقی سـەرت دەفعـەیی مـەیلم کـە وەلایـە

مـانی دڵەکـەم رەسمـی هـیلالی تـو دەکێـشێ
تا چـەرخی فەلـەك نەقـشی ویـسالی تـو دەکێـشێ
(عاصـی) بـە جـەفا جـەورو مـەلالی تـو دەکێـشێ
خـوونم بـڕژێ عەکـسی جـەمالی تـۆ دەکێـشێ
تـا نـەمکوژی نـازانی کـە (سـافی) بـە وەفایـە

(٩)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(ڕەمەلی هەشتی مەقسوور)

## تەخمیسی غەزەلی حەزرەتی مەولانا خالید (قدس سره) بە موناسەبەتی ئەوەی لەگەڵ قەزیەی کوردی پێك دەچن چونکە ئەویش ناڕەزایی دەربڕیوە بەرامبەر مەقسوودی خۆی منیش بەو نەوعە تەخمیسم کرد

یـازدەمینی مـانگی ئـازار نۆسـەدو حـەفتاو چـوار
چەرخی هیوا کەوتـە چـەپگەردەرحەقی ئێمـەی هـەژار
ئەشکی حەسرەت وا لە چاومان بۆتە خوێن و دێتە خوار
موسـم عید اسـت مـا نومیـد از دیـدار یـار
عـالمی درعـیش و نـوش و مـاو چـشم اشـکبار

شان بە شانی یارە عالەم وا لە گوڵـشەن تـەن بـە تـەن
مـن دەگریـەم زۆر بـە ناسـۆر داخەکـەم بۆتـۆ وەتـەن
کەوتنە بەر پێی ناحەزی خۆت سونبول و لالـەو چـەمەن
هرکسـی بایـار در گشت گلستان است و مـن
زشکی سرخم شد کنار از داغی هجـران لالـەزار

نیشتمان داخی گرانم هاته سەرتۆ هەوری غەم
بۆ هەموو قەومی عەزیزت هەر ئەتۆ بووی جامی جەم
چۆن نەگریەم قورِ بەسەر کەم کەوتیە ژێرباری ستەم
جان نثار مقدم جانان نکردم دم بدم
چیست بهره از تفرجگاهی تخت جان نثار

حەقمە گەر من زوو بسووتێم دائیما هەروەك سپەند
بێ شعوورو دڵ بە ئێش و دەردەدارو موستەمەند
سەدئەسەف رۆیی لەدەستمان هیچ کەسێك تۆڵەی نەسەند
بی نواو دل پر از خارو غریب و دردمند
دست بردل سر بزانو چشم در ره دل فگار

بێ کەسە ئەم نیشتمانە چۆن هجوومی کردە سەر
هێزی بێگانە لە دوور هات گشتی کردن دەربەدەر
کەس نەبوو وەك شێری مەست بێ روو لەمەیدان بێتەدەر
سینه سوزان دل فروزان کوچەکوچە در بدر
کس مبادا هم چومن اواره از یارو دیار

سەیری کەن منداڵەکانمان چۆن دەگریەن وا بە کوڵ
حەسرەتا بۆ ناسکەکانی غونچە لێوو کوڵمە گوڵ
هەروەکوو بولبول بەزاری وا دەسوورێن چل بە چل
بکره جویی شد زهر چشم روان از خون دل
عاقبت کردم دوا داغ فراق سرچنار

(عاصی) گەر هۆشت لە خۆیە موبتـەلانی تـۆ بـەدەرد
پیاو بە تەسـلیمی قـەزا بـە روومەکـە نـاو دار و بـەرد
رووبکـە دەرگـاهی لوتـف و رەحمـەتی یـەزدانی فـەرد
خـالــدا گرنیـسـتی دیوانـــە و صـحرا نـورد
تو کجـا کابـل کجـا و غـزنین و خـاك قنـدهار

❊ ❊ ❊

(١٠)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رەمەلی هەشتی مەقسوور)

# تەخمیسی قەسیدەی حەزرەتی ئەبووبەکری سدیق بە کوردی

پــیرو ئوفتــادەو زەعــیفم ناتــەوان و هــەم عــەلیل
بــێ زەخــیرەی زادی تــەقوا بــێ نــەواوو هــەم رەزیــل
بەشقی رووحی فــەخری عالــەم حورمــەتی زاتــی خــەلیل
جــد بلطفــك یــا الهــی مــن لــه زاد قلیــل
مفلــس بالــصدق یــأتی عنــد بابــك یــا جلیــل
گەرچی من بــەدكارو بــەدخووم تــۆی خوداوەنــدی رەحــیم
ئیلتیجــام هێنایــە قاپیــت یــا غــەفوورو یــا رەحــیم
ســائیلم هاتوومــە دەرگــەت یــا غــەنیی و یــا کــەریم
ذنبــه ذنــب عظــیم فــاغفر الــذنب العظــیم
انــی شخــص غریــب مــذنب عبــد ذلیــل

بێکەس و مـەفتوون و عـاجز وا لـە حـوجرەی پـڕ غـەما
رووم لـە سـفرەی رەحمـەتت کـرد هـیچ ئومێـدێکم نـەما
دەسـت و چـاوم وا بلّنـد کـرد یـا ئیلاهـی بـۆ سـەما
قـل لنـاری ابـردی یـارب فـی حقـی کمـا
قلت قل یـا نـار کـونی انـت فـی حـق الخلیـل
وا دڵـی گرتـووم بـە جـارێ قەسـوەتی بـوغزو حەسـەد
گەرنـەکا مـەحوی لـە سـەردڵ ( قـل هـو الله احـد )
هەر دەبێ غـەرقی عـەزاب بم مـن لـە دۆزەخ تـا ئەبـەد
قـال یـا رب ذنـوبی مثـل رمـل لایعـد
فاعف عنی کـل ذنـب فاصـفح الـصفح الجمیـل
لەشـکری غـەم دەوری داوم رێ نـەماوە بـۆ سـروور
زولمـەتی غـەفلەت بـە جـارێ لای نەهێـشتم زەڕڕە نـوور
هەر ئەتۆی شافی حەقیقی و عالیمی ( مافی الـصدور )
انـت شـافی انـت کـافی فـی مهمـات الامـور
انـت ربـی انـت حـسبی انـت لی نعـم الوکیـل
مـن کـە هەرچـەند رووسـیاهم پـڕ گونـاه و هـەم لـەئیم
خۆت بە خۆت فەرمووە لـە قورئـان ( اننـی رب رحـیم )
وا لـەتۆم داوایـە یـارەب حـوورو جەنناتونـنـەعیم
رب هـب لی کنـف فـضل انـت وهـاب کـریم
اعطنـی مـا فـی ضـمیری دلنـی خـیر الـدلیل

پێقەگیرم بوون بە جارێ پیری یو بێ تاقەتی
بووە نەنتیجەی عومری گەنجیم سستی یو بێ تاعەتی
ئەی خودایا تۆی تەبیب و دافیعی هەر ئافەتی
عافنی من کل داء واقض عنی حاجتی
ان لی قلبا سقیما انت من تشفی العلیل
موبتەلا بوو دڵ بە غەفڵەت پڕ شیقاق و پڕ خیلاف
تەوبە بێ ئەم جا ئیلاهی بێ درۆ و لاف و گەزاف
ڕێم بدە تا بێمە ماڵت یەعنی کەعبە بۆ تەواف
هب لنا ملکاً کبیرا نجنا مما نخاف
ربنا اذ انت قاض والمنادی جبرئیل
قەلبی داگرتم بە جارێ زولمەتی توولی ئەمەل
بێ حەیا بووم قەت نەترسام هیچ لە شمشیری ئەجەل
ڕووم نەکردە ڕێی سەعادەت بیکەمە ( نعم البدل )
کیف حالی یا الهی لیس لی خیر العمل
سوء اعمالی کثیر زاد طاعاتی قلیل
حەزرەتی قابیز ئەوا هات ( عاصی ) یا بۆ قەبزی ڕووح
چی بە سەرهات ئەهلی شەوکەت ساحیبی فەتح و فوتووح
کوا فوحوولی عیلمی دینی دانەری مەتن و شرووح
این موسی؟ این عیسی ؟ این آدم ؟ این نوح ؟
انت یا (صدیق) عاص تب الی مولی الجلیل

## (٥٢)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هزج مثمن سالم)

منـــال ای ادل ز درد خـــود طبیـــب بـــی جفـــا دارم
بخـــواه از وی عـــلاج خـــود حکـــیم پـــر شـــفا دارم
بهـــــــر دردی دوا دارد جراحـــــــت را نیـــــــازارد
کـــه کـــام تـــو بجـــا آرد چـــو شـــاهی پـــر عطـــادارم
دلا گـــر کـــوری از دیـــدن ببرحاجـــت بـــشاه مـــن
بلـــور عهـــد او مـــشکن چـــراغ خـــوش ضـــیا دارم
بنامش شد علاء الـدین بـه اوصـافش عمادالـدین
زگلـــزار ضـــیاء الـــدین مـــن آن ســـروی وفـــا دارم
بصورت یوسـف یعقـوب زگـنج صـبر چـون ایـوب
بلطـــف حـــق شـــده مجـــذوب زفـــیض او صـــفادارم
بیـــا (عاصـــی) اگـــر خـــواهی مقـــام عـــزت شـــاهی
بـــــشو دربـــــان درگـــــاهی از آنجـــــا التجـــــا دارم

❊ ❊ ❊

(۵۳)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رمل مثمن محذوف)

شورشـــم در سرچـــنان اســـت دفـــتری انـــشا کـــنم
راز دل عـــالم بگـــویم فکـــری خـــود افـــشا کـــنم
همچو مجنون کوه وصحرا طی کـنم بـر خیـل عـشق
دل فـــدای شـــوخ ســـروی شـــیوهء لـــیلا کـــنم
ســـرنهم در زیـــر کـــویش فخـــر برگـــردون کـــنم
بعـد از آن در شـکر نعمـت سـجده بـر مـولا کـنم
دل چـو صـید از دام عـشقش حـبس چـاه غبغـبش
در فـضای هجـر خـواهم جـان و دل یغمـا کـنم
کوه طور است کـوی یـارم در اجابـت ریـب نیـست
ار مناجـــات وصـــال ســـرور موســـی کـــنم
روضه اش را سجده‌گاهی جن وانـس اسـت از دوعـا
قبلـــهء مقـــصود خـــود را ســـرور بطحـــا کـــنم
گرچـــه درحـــد میگـــذارد جـــرم وعـــصیانم ولی
رو بمحـــراب دوعـــای زمـــزم ومینـــا کـــنم

گـــر زاعجـــاز چـــو دریـــا قطـــره‌ای ریـــزد بخـــاك
مرده‌هـــا را بـــانگ آرنـــد بـــوی از عیـــسا کـــنم

در جمـــالش نـــور وحـــدت ار ببخـــشد بـــر زمـــین
بـــدر گویـــد از خجالـــت خـــود شـــب یلـــدا کـــنم

گرچـــه از رنـــگ گنـــاهم چـــون حـــبش شـــد چـــهره‌ام
بـــس کـــه روی لـــوح دل را بـــر رســـول الله کـــنم

دولـــت وصـــلش الهـــی از خـــزان لطـــف خـــود
بخـــش بـــر مـــا زیـــن جهـــان و بوســـهء زانجـــا کـــنم

ســـرمه خـــاك زیـــر پـــای پاســـبان درگهـــش
مـــی کـــشم بـــر نـــور دیـــده چـــشم و دل بینـــاکنم

(عاصـــی)ا وقـــت ســـحرها کـــن دعـــای وصـــل یـــار
تاچـــو ســـگ در خـــان جـــودش لقمـــه‌ای پیـــداکنم

(٥٤)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن
(هزج مثمن سالم)

نــه در حــد زبــان ومــن نــه در افكــار مــى بيــنم
همــه اوصــاف و اخلاقــش نــه در اقــرار مــى بيــنم
چه گويم بيشتر زانكه چـونامش شـد عــلاء الـدين
از آن روزى كــه ســلطان تــرا عطّــار مــى بيــنم
زبــاغ نقــشبنديها گــل بــى خــار مــى بــودى
كه بوى گـل روخـت جانـا نـه از گلـزار مــى بيــنم
زآبــى چــشمهء رحمــت تنــت سـيراب وپــر بــر شــد
بهر كـس سـايه افگنــدى دلـش بيـدار مـى بيـنم
چه بــاك ازمنكــرى بـدگو اگــر صـدبار بـد گويـد
كه من با فخر عالم چند كـسى انكـار مـى بيـنم
بــدرگاهت كمــر بــستم تهــى دســت از همــه چيــزم
بيك رمــزى چــو اكـسيرت گــدا سـردار مـى بيــنم
بكــوى لطــف ايــستادم تــرحّم وقــت امــداد اســت
زديــرى غــربتم شــاها خــودم غمبــار مــى بيــنم
درين سهوم بكن عفوم منم (عاصى) از ايــن ســودا
دل و ديــنم بــشد يغمــا تــرا مــن يــار مــى بيــنم

## (۵۵)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رمل مثمن مقصور)

چشم ای دل برگشا و رحمت مولا ببین
خلعت لولاك احمد وسعت بطحا ببین
رو بروضه باد کردی گرتو خواهی عزتی
خان و مان روضه بین و عزت آنها ببین
قبلهء مقصود عالم جلوه بخش انبیاء
بردر محبوب یزدان حرمت بی پا ببین
در سرای حشر بینی شه‌سوار مرسلان
بنگر از روی شفاعت شوکت طه ببین
فکر در معراج ذاتش کافیه است از قدر او
جملهء قرآن تماشا عزت اسری ببین
فخر بر گردون نماید نام (عاصی) امت است
ای دل ازبیم قیامت رأفت لولا ببین

* * *

## (٥٦)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(رمل مثمن مقصور)

آه گـــر بینم هـــوای روضـــهء رضـــوان تـــو
مـــن نخـــواهم در قیامـــت جـــز وصـــال صـــدردین
دوســـت داری کـــی شـــود بـــا ملـــك دنیـــا وصـــل او
گـــر کنـــد لطـــف بســـوی آن ســـفیه دل حـــزین
فـــاتح بـــاب هـــدایت شهـــسوار أنبیـــا
ســـرور اولاد آدم هـــم (شـــفیع المـــذنبین)
(عاصی)م ای انکه (عاصـی) در پنـاه لطـف تـو
دارد امّیـــدی نجـــاتش از عـــذاب عاصـــیین

*　　*　　*

(٥٧)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(رمل مثمن محذوف)

ای ضـــیای ظلمـــت دل همـــچو ع م ر
وی ولی عهـــد خلافـــت تاجـــدار ش ه
نونهـــال بـــاغ عثمـــان در گلـــستان وفـــا
ســـروی رعنـــا منفعـــل از ق ا م ت
کـــوی سـلطان زمانـــه چـــون بدیـدم زان میـــان
دل بـــسوزد در فـــراقش همـــچوف ن ر
گوهراسـت در بحـر عرفـان شـب چـراغ مرشـدان
اوســـت از بحـــر حقیقـــت س ا ق ی
شمـع بـزم ارای دیـن اسـت عـالمش پروانـه شـد
در سمـــوات حقیقـــت همـــچو ق م ر
پادشـاهی چـون تـو شـاها بـا جـلال وسـلطنت
در جهـــان هرگـــز نیـــارد م ا د ر
بـردر سـلطان لطفـت همـچو سـائل چـشم دار
ریـــز خـــواهی خـــوانی جـــودت (ع ا ص ی)

* * *

(۵۸)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
(هزج مثمن سالم)

بحمـــدالله موحدشـــد دلم از فـــضل ربـــانی
دگـــر کـــاری نمیـــدانم بجـــز راه مـــسلمانی
سـراپا راه دیـن حـق بلـوح دل نقـش مـی بـست
بـدل تـصدیق مـی کـردم همـه اوصـاف رحمـانی
زهـر عـضوی نظـر کـردم بـر اقـرار ره توحیـد
نمـی بینـد بهـر فکـری خداونـدی دگـر ثـانی
همـه خـشنود برشـاهی کـه نـامش احمـد مختـار
گـواهی خـاتمی دادنـد پـس از توحیـد ربـانی
چـنان داننـد مقـام او نـه درحـد کـسی باشـد
نبیننـــد جایگـــاه او کـــسی از نـــوع انـــسانی
مقـــام انبیاهـــا را چـــنان بـــاور نمایـــد دل
همـه پیغمـبری دارنـد زگـنج لطـف سـبحانی
الهـی برهمـان دعـوی رجـا را مـی کـنم مـردن
زوقـت نـزع مـی خـواهم نجـات از کیـد شـیطانی

**خــدا از خــوانى احــسانت مــن بــى زاد تقــوى را**
**كــرم كــن لقمــه‌اى يــا رب بــر ايــن نــادان حيرانــى**
**نوشتن نام خود (عاصى) همان اقرار عصيان اســت**
**اميد است عفو عصيانم مــن از معبــود بــى ثــانى**

تەواو بوو بەشى فارسى لە رۆژى ٢٢ جمادالاول ١٣٩٠ بەرابەر ٢٥ ى تموزى ١٩٧٠ .
الكاتب ملا مصطفى عاصى، دانەرى ديوانەكە بە فارسى وكوردى

❊ ❊ ❊

(۱)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان
(الرمل الثمانی المقصور)

صـــرت غرقـــاً في الخطايـــا ذاب قلبـــى بالـــذنوب
راجيـــا جئـــت ببابـــك انـــت ســـتار العيـــوب
روســـــياه روی نيكـــــان در ســـــرای محـــــشرم
ربنـــا تبـــت اليـــك انـــت غفـــار الـــذنوب
در گذار از جرم و عـصيان نيـست ملجـأ غـير تـو
فـــاعف عنـــى يـــا الهـــى انـــت فتـــاح القلـــوب
زانـــدمی گـــشتم مكلـــف در گنـــاهم هـــر دمـــى
ربنـــا اذ انـــت تـــدری انـــت عـــلام الغيـــوب
(عاصـــى)ا عـــاری نـــدارد بـــاز آي بـــر دعـــا
راجيـــا جئـــت ببابـــك انـــت ســـتار العيـــوب

* * *

(٢)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(الرمل الثمانى المحذوف)

يــا حبيبــى حيــث وصــلك فــى الفؤادقــد عــرض
نورحبــك في البــساط مثــل شمــس قــد فــيض
فــى صــدور العاشــقين نــار حبــك ســاطع
هــا أنــا كنــت بــذاك كــل جــسمى قــد رمــض
كنــت في بعــد الوصــال كالــسقيم النــافض
ارجــو منــك للــدواء ان روحــى قــد مــرض
صــرت في قلبــى حبيبــا ثابتــاً في لوحهــا
لايــزول بــالملام لــيس شــىء قــد قــرض
كنــت (عــاص) صــار عمــرى في الظــلام[1]
جــاء مــصباح الحبيــب مثــل فجــر قــد بــيض

❊ ❊ ❊

[1] ئەم لەتە سێ تەفعیلەیە.

(٣)

فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(الرمل السداسي المحذوف)

يـــا حبيبـــى وصـــلك لى ان حـــصل
نيـــست بـــاكم نـــيش شمـــشير اجـــل
بـــر جگـــر تـــيرم زنـــى ايـــستاده ام
فهـــو بـــاب للنجـــاة ان وصـــل
زهـــر مـــى نوشـــم ز دســـتت يـــا حبيـــب
لـــيس لـــي ســـم شـــفاء كالعـــسل
بـــر همـــان عهـــدى تـــو گفتـــى مانـــده ام
ان قلبـــى في الـــوداد مانقـــل
(عاصـــي)م عبـــد تـــوم اى جـــان مـــن
فـــارحم العبـــد الـــضعيف في الامـــل

❊ ❊ ❊

# فەرهەنگۆك

**ئەو وشانەی لەم فەرهەنگۆکەدا هاتوون، بە پێی چۆنیەتی هاتنیان لە دیوانەکەدا مانایان لێ دراوەتەوە. جگە لەوەی هەندێ دەستەواژە و ڕستەیشمان وەکو خۆی نووسیوەتەوە و مانامان لێ داوەتەوە.**

(( ء ))

**ئاخیر(آخر):** دوایین، دوا شت یان دوا کەس.
**ئاسار(آ ثار):** کۆی (أثر)ە: پاشماوە، شوێنەوار.
**آستانە:** دەرگا، بەردەرگا، کەوشکەن، دەربار، بارەگا.
**ئاشووب:** ئاژاوە، فتنە، پشێوی، گێلەوێژە.
**ئاشفتە:** تێکەڵ و پێکەڵ، شێواو، سەرگەردان.
**ئافاق (آفاق):** کۆی (افق)ـە: ئاسۆ، سووگە، ئاسووگە.
**ئامانج:** مەبەست، نیشانە.
**ئاموشۆ(آمد و شد):** هات و چۆ، وەرە و بڕۆ.
**ئاوەردە:** هاوردە، هێنراو.
**ئاور:** ئاگر.
**ئاورین:** ئاگرین.
**ئاهوو:** ئاسك، مامز، ڕوال، جەیران.
**ئایینە:** ئاوێنە، نەینۆك، قودیلك، جامەك.
**ئەب (أب):** باو، باوك، باب.
**ئەبەد(أبد):** هەمیشە، دایم، تم و تم، کاتی بێ کۆتایی، ڕۆژگار.

**ئەبتەر(أبتر):** کلکبڕاو، ناتەواو، وجاغ کوێر.
**ئەبرار (أبرار):** کۆی (بار)ە: چاکەکار، خێرخواز، خێرەومەند.
**ئەبلەه(أبله):** گێل، گەمژە، هێڕ، کەودەن، لێوە، دەبەنگ، گەوج.
**ئەبی وەردی (أبي وردي):** ناوی (محمد أبو المظفر)ە. لە (کوفان)ی نزیك أبیورد لە(خوراسان) لەدایك بووە. شاعیر و ڕەچەڵەکناسێکی سەردەمی ئومەوی بوو. ساڵی(١٨٦٠) هەندێ لە شیعرەکانی لە دیوانێکدا لە میسر بڵاو کرایەوە. ساڵی (١١٣) لە ئەسفەهان ژەهرخوارد کرا.
**ئەتباع (أتباع):** کۆی (تابع)ـە: شوێنهەڵگر، سەر بە یەکێ یان بە ڕێبازێ، پەیڕەوکەر.
**ئەتوار(أطوار):** کۆی (طور)ـە: جۆر، حاڵەت، رادە، ئەندازە، قۆناغ.
**ئەجەل (أجل):** کۆتایی ژیان، ماوە، ساتی مەرگ و مردن.
**ئەجر (أجر):** کرێ، دەستهەق، مز.
**ئەجزاخانە:** دەرمانخانە.
**ئەجنەبی (أجنبی):** بێگانە، غەوارە، لایدە.
**ئەحەد(أحد):** تاك و تەنیا.
**ئەحباب(أحباب):** کۆی(حبیب)ـە: خۆشەویست، ئازیز، دۆست، یار.
**ئەخ(أخ):** برا.
**ئەختەر:** ئەستێرە، بەخت، ئاڵا، گیایەکە گەڵاکانی درێژو گەورەن، گوڵی وردی سوور یان زەرد دەدا وەکوو هێشوو بەسەر چلەکانەوەن. تا(٢ م) بڵند دەبێ.
**ئەدا(أداء):** جێ بە جێ کردن، ئەنجام دان.
**ئەدیر(أدر):** بگێڕە، تێ کە.
**ئەدنا(أدنى):** هەرە نزیك، هەرە نزم.
**ئەرباب(أرباب):** کۆی(رب)ـە: خودا، خاوەن، ماخۆ.بە فارسی مانای ئاغایە.
**ئەرجومەند:** خاوەن قەدر، ڕێزدار، پیاوی گەورە، هێژا، بەهادار.
**ئەرز(أرض):** عەرز، عەرد، زەوی، زەمین.
**ئەرزەلونناس(أرذل الناس):** پەست و نـزمترین کەس، کەمترین کەس، چرووکترین کەس.
**ئەرغەنوون:** جۆرە ئامێرێکی مۆسیقییە وەکوو پیانۆ وایە، گوایە ئەفلاتون دایهێناوە.
**ئەز:** من، (بە فارسی یانی: لە).
**ئەزەل(أزل):** هەمیشە، دێرین، ئەوەی سەرەتا و بنەتای نەبێ، رۆژی بەرێ.

**ئەژدەها:** ماری زۆر گەورە.لە ئەفسانەی کۆن بەو مارە گەورەیە دەڵێن کە ئاگری لەدەم دێتە دەرەوە و زۆر جار سێ سەر یان حەفت سەریشە.
**ئەسرار**(**أسرار**)، کۆی(سر)ە: نهێنی، راز، نەپەنی، شاراوە.
**ئەسرین:** فرمێسک، سرشك، رۆندك، ئەشك.
**ئەسل**(**أصل**): بنچینە، بنەچەکە، بنیاد.
**ئەسیر**(**أسیر**): دیل، یەخسیر، گیراوی شەڕ.
**ئەشعار**(**أشعار**)، کۆی(شعر)ـە: هەڵبەست، هۆنراوە.
**ئەشك:** فرمێسك، سرشك، رۆندك، ئەشك.
**ئەژنۆ:** چۆك، زرانی.
**ئەعرەزەت**(**أعرضت=اعرض + ت**): خۆی لێ لادا، خۆی لێ کەلی کرد.
**ئەغنام**(**أغنام**)، کۆی(غنم)ـە: مەڕ، پەز، می، مە.
**ئەغیار**(**أغیار**)، کۆی(غیر)ـە: ئەوەی تر، نەناسیاو، بێگانە.
**ئەقتار**(**أقطار**)، کۆی(قطر)ـە: وڵات.
**ئەقربیا**(**أقرباء**)، کۆی(قریب)ـە: خزم، قەوم و قیلە، نزیك.
**ئەلئەمان**(**الامان**): دەخیلە!، چەپاڵەم بدەن، بمپارێزن.
**ئەلەم**(**ألم**): ژان، ئێش، ئازار، دەرد.
**ئەلبورز:** کێوێکی گەورەیە.
**ئەمارەت**(**أمارة**): میرنشینی، میرایەتی.
**ئەمەل**(**أمل**): هیوا، ئومێد، ئاوات.
**ئەمما**(**أمّا**): بەڵام، کەچی.
**ئەنبیا**(**أنبیاء**)، کۆی(نبی)ـە: پێغەمبەر.
**ئەوج**(**أوج**): ترۆپك، قۆتك، چلەپۆپە، تۆقەڵە، تۆپکە، تەپك.
**ئەیاغ:** کاسە، جام، بادە.
**ئەینەلمەفەڕ**(**این المفر**): بۆ کوێ هەڵێین؟، راکەینە کوێ؟.
**ئوتلوبوو**(**أطلبوا**): داوا بکەن، بخوازن.
**ئوتمۆبیل**(automobile): ترۆمبێل، ماشین، خۆشبەزۆك.
**ئوفتادە:** کەوتوو، کەترە، لەپێ کوتوو، زەبوون، کەسیرە.
**ئولفەت**(**ألفة**): هۆگریی.

**ئۆلمش:** مردوو.
**ئیبیەززەت(ابیضت):** سپی بوو.
**ئیحاتە(احاطة):** دەورەدان، تۆق کردن، گرتنە خۆ.
**ئیحسان(احسان):** چاکە، خێر.
**ئیحمەڕڕەت(احمرّت):** سوور بوو.
**ئیجابە(اجابة):** وەڵام دانەوە، باوەگۆ.
**ئیدراك(ادراك):** دەرك کردن، تێگەیشتن.
**ئیزکار(اذکار):** ناو هێنان، دوعا، ویرد.
**ئیزمار(اضمار):** شاردنەوە.
**ئیستیعفا(استعفاء):** داوای بوردن، داوای خانەنشین کردن.
**ئیستیقرار(استقرار):** سەقام گرتن، جێگیر بوون، دامەزران.
**ئیستیك:** وەستانێکی کەم لە ئەنجامی سەرسامی، سەنگرانەوە.
**ئیستیلا(استیلا ):** دەست بەسەردا گرتن.
**ئیستیمداد(استمداد):** هانا بردنە بەر، داوای یارمەتی کردن.
**ئیستینتاق(استنطاق):** بە قسە هێنان، ئاخێوان.
**ئەسرا(أسری):** شەوڕۆ.
**ئیسفەڕڕەت(اصفرّت):** زەرد بوو.
**ئیسوەددەت(اسودّت):** ڕەش بوو.
**ئیشتیاق(اشتیاق):** پەرۆشی، غەریبی کردن.
**ئیشگوزار:** سەرکار، نوێنەر، ئیش پەیداکەر.
**ئیعتیبار(اعتبار):** متمانە، بڕوا.
**ئیفلیج:** شەپلە، شەلەل.
**ئیقبال(اقبال):** بەخت، یەغباڵ.
**ئیقتیدا(اقتداء):** شوێن کەوتن، پەیڕەوکردن، لە دوو ڕۆیشتن.
**ئیکسیر:** ماددەیەکە گوایە کرۆکی شت دەگۆڕێ.بۆ نموونە جیوە دەکا بە قەڵایی و مس دەکا بە زێڕ.ئەم ماددەیە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە.بە شتی زۆر دەگمەن و بەسوود دەگوترێ.ئەو پیرەی سروشت و خووی کەسێ بگۆڕێ.
**ئیکلیل(اکلیل):** تاج.

**ئیلاهی(الهی):** خودایە!
**ئیلتیجا(التجاء):** پەنا بردنە بەر، هانا وەبەر بردن، خۆ دەخیل کردن.
**ئیلحاح(الحاح):** سوور بوون، جەخت کردن، پێ لەسەر داگرتن.
**ئیمشی(امشِ):** برۆ، هەرە، بچۆ.
**ئینتیزار(انتظار):** چاوەڕوانی، لە هیڤی بوون.
**ئینتیزام(انتظام):** ڕێك و پێکی، هەماهەنگی.
**بوزرگ:** گەورە، مەزن.
**بوراق:** ناوی ئەو ئەسپەیە کە پێغەمبەرپێی چووە ئەسرا و میعراج.
**بورهان:** بەڵگە.
**بیسمیل کردن:** پاك کردنەوەی شتی پیس لە رووی ئایینییەوە و ناوی خوا هێنان لە کاتی پاك کردنەوەکەدا.
**بیداری:** هوشیاریی، بە ئاگایی.
**بیلعوموووم(بالعموم):** بە تێکڕایی، بە گشتی، هەموو لە هەموو.
**بیللا(باللّه):** بەخوا، بخودێ.

((پ))

**پابەستە:** پێ بەسراو.
**پابووس:** پێ ماچ کردن، درکەیە لە چوونە خزمەت پیاوی گەورە.
**پەرتوو:** تیشك، نورر.
**پەرگار:** ئامێرێکی دووفلیقانەیە لەسەرێکەوە هەردوو لقی بەجۆرێ بەیەکەوە بەسراوە کە بواری سووڕانیان هەیە، بۆ کێشانی بازنە و ئەندازە گرتنی هێڵی راست بەکار دێ.
**پەروین:** چەند ئەستێرەیەکی وردن وەکو تۆپ کۆبوونەتەوە سەریەك، پێروو.
**پەشەنگ:** شیشە ئاسنێکە زەوی یان دیواری پێ کون دەکەن.
**پەشم:** خوری، پەشمە: خراپە، هیچە، بێنرخە.
**پەلاس:** بەرگی خوری ئەستوور و درِ، دەروێش و بێنەوایان لەبەری دەکەن.
**پەیکان:** تیر، سەرە نێزە، پارچە ئاسنێکی تیژە بەسەری تیر و نێزەوە.
**پوستان:** مەمك، مەم.

**پیر**: مرۆڤ و گیانداری بە ساڵداچوو، ئیختیار، رابەری ئایینی.

((ب))

**بایزاغە**: گەڕەکێکە لە شاری کۆیە.
**بەتحا(بطحاء)**: دۆڵی مەککەی پیرۆز، ڕێڕەوی گەورەی ئاو، رووبار، خوڕێکی بە زیخ و چەو.
**بەدەخشان**: ناوچەیەکە لە تورکستانی ئەفغان بە لەعل بەناوبانگە.لەعلی بەدەخشان زۆر لە شیعری کلاسیکی **کوردیدا** هاتووە.
**بەدخواه**: خراپەکار، بەدنیاز، بەدکار.
**بەدر(بدر)**: مانگی پڕ، مانگی چواردە.
**بەدگۆ**: ئەوەی قسەی خراپ و تێکدەرانە دەکا.
**بەرات**: کرێی وەرزی رەنجبەر، جیرەی هەمیشەیی. رزق و روزی بەش کردن، نیوەی مانگی شابان:

شەوی جەژنی بەراتێ
لەخوا دەکەم تەلەبێ
بەشکو چاوجوانێم داتێ

**بەرق(برق)**: برووسکە، چەخماخە، (بە فارسی واتە: کارەبا).
**بەرگەشتە**: سەرەنگون، بەجێماو، هەڵگەڕاوە، بەرەواژی، ئاوەژوو.
**بەسیت(بسیط)**: سادە، ساکار.
**بەست(بسط)**: کردەوە بنچینەییەکانی بیرکاری وەکوو کۆکردنەوە و دەرکردن و لێکدان و دابەش کردن.
**بەسیر(بصیر)**: بینا، بە پیاوی نابیناش دەگوترێ.
**بەقا(بقاء)**: مانەوە، وەفا.
**بەلدەت**: **ناوچەیەکی** چۆڵ و بێبن و نادیارە لە گەردوون بە چاوی ئاسایی ئەستێرەی تێدا نابینرێ.
**بەندە**: کۆیلە، عەبد.
**بریان**: برژاو، بۆدراو.
**بزەن**: (ب + زەن = رەگی(زدن)ی فارسی): لێدە، بکوتە.

**بوختان:** قسه پێ هەڵبەستن.

((ت))

**تاجی:** تانجی، تاژی، سەگی ڕاو.
**تاعات(طاعات)**، کۆی(طاعة)یە: خواپەرستی، بەجێ هێنانی ئەرکی ئایینی.
**تەبەسسوم(تبسم):** گرنژین، گرژینەوە، زەردەخەنە هاتن، خنینەوە.
**تەبیب(طبیب):** دختۆر، پزیشك.
**تەحدیس(تحدیث):** باس کردن.
**تەرجیح(ترجیح):** پەسەند کردن.
**تەحریر(تحریر):** نووسین، تۆمار کردن، ئازاد کردن.
**تەحسین(تحسین):** ئافەرین کردن، بە چاك زانین.
**تەرەققی(ترقی):** چونە پێش، بەرز بوونەوە.
**تەرویج(ترویج):** برەو پێدان، رەواج پێدان.
**تەزەروو:** کەڵەشێری لێڕەوار.
**تەسەللا:** دڵدانەوە، دڵخۆش کردن.
**تەسبیح(تسبیح):** پاکانە بژێری بۆ خوا.
**تەسخیر(تسخیر):** خستنە بەردەست، خستنە ژێربار.
**تەشەببوس(تشبث):** دەست پێوە گرتن، دەخیل بوون.
**تەشەککی(تشکی):** گازاندەکردن، سکاڵاکردن.
**تەشریح(تشریح):** توێ توێ کردن، پارچە پارچە کردن.
**تەعام(طعام):** خۆراك، خواردن، زاد.
**تەعقیب(تعقیب):** بەدوادا چوون، شوێن هەڵگرتن.
**تەعمیر(تعمیر):** ئاوەدان کردنەوە، نووژەن کردنەوە.
**تەفەککور(تفکر):** بیر کردنەوە.
**تەقوا(تقوی):** خواپەرستی، خۆ دوور خستنەوە لە گوناه و شتی خراپ.
**تەکەببور(تکبر):** لووتبەرزی، دەعیە، روحگەورەیی، ترزلی.
**تەکەللوم(تکلم):** قسە کردن، ئاخاوتن، دوان.

**تەکسیر(تکسیر)**: شکاندن.
**تەلەف(تلف)**: چواندن، لەنێو بردن، نەهێشتن.
**تەمەننا(تمنی)**: ئارەزوو کردن، خۆزگە خواستن.
**تەناب(طناب)**: پەت، رستەکە، گوریس.
**تەوازوع(تواضع)**: بێ دەعیەیی، خاکەڕایی.
**تەواف(طواف)**: سووڕانەوە بە دەوری شتدا.
**تەوزیم**: بە خورتی، بەکوتەکی، بەزۆری.
**تەوەللا(تولّی)**: ڕوولێ وەرگێڕان، لێ دوورکەوتنەوە.
**تەنهەر(تنهر)**: تێی ڕادەخوڕی، لێ دەخوڕیتەوە، خۆی لێ تووڕە دەکا.
**تەی(طی)**: پێچانەوە، بڕینی ڕێگا.
**تەهی دەست**: دەست بەتاڵ.
**ترخێنە**: جۆرە خواردنێکی میللی کۆنە.لە بڕووشی درشت و شێلم دروست دەکرێ. شێلمەکە بە گەڵاوە ئەنجن ئەنجن دەکرێ و لە بڕووشەکە دەکرێ و هەندێ خوێی پێوە دەکرێ و بۆ ماوەی حەفت تا دە ڕۆژ هەل دەگیرێ و ناو بە ناو تێك وەردەدرێ.پاشان دەردەهێنرێ. ئاوا بە تەڕی دەخورێ یان دەکرێتە چێشت، یان بە شێوەی تۆپەڵ تۆپەڵ وشك دەکرێتەوە بۆ کاتی پێویست.
**توووبا(طوبی)**: پاکی، خێر و خۆشی، ناوی درەختێکە لە بەهەشت.
**تووتیا**: سورمە، ئۆکسیدێکی مسە لەناو کوورەی تواندنەوەی مس و قەلایی پەیدا دەبێ. ئەو دووکەڵەیە لە کاتی تواندنەوەی مس لەسەر کوورە کۆ دەبێتەوە.
**توحفە**: دیاری، شتی دەگمەن و گرانبەها.
**توور(طور)**: چیایەکە لە (سینا).حەزرەتی مووسا دەچووەسەر ئەو چیا و قسەی لەگەڵ باری تەعالا دەکرد.
**تووڕە(طرة)**: مۆری شا و قراڵەکان بوو، بە پەرچەمی ئافرەتیش دەگوترێ. توڕڕەدار: خاوەنی توڕڕە.
**توول(طول)**: درێژیی.
**تولووع(طلوع)**: هەڵاتن، دەرکەوتن.

((ج))

**جامی جەمشید:** جەمشید: کوڕی تەهمورس بوو. چوارەم شای پیشدادییەکان بوو. بە گوێرەی شانامە حەفت ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە.گوایە ئەو بووە جەژنی نەورۆزی داهێناوە (جەمشاسپ)یشی پێ دەڵێن. (جام)ێکی ئەفسانەیی هەبووە دونیای تێدا دەدەی.
**جاویدان:** نەمر، هەمیشەیی.
**جەبهە:** نێو چەوان، تەوێل، تەبەش، هەنیە.
**جەحیم(جحیم):** دۆژە، دۆزەخ.
**جەدوەل(جدول):** خشتە، هێڵی لێك تێپەڕیوی ستوونی و ئاسۆیی.
**جەدی(جدی):** ئەستێرەیەکی گەشە لە ولاتی ئێمەدا بەرامبەر قیبلە دەوەستێ.
**جەزب(جذب):** راکێشان، حاڵ گرتن.
**جەسوور(جسور):** ئازا، بوێر، رەشید، عەگید، چاونەترس.
**جەفا:** دەردەسەری، ناخۆشی، ئازارو ئەشکەنجە.
**جەفادیدە:** جەفادراو.
**جەفر:** زانستی ژمارە(chiffre). جەفرناس وا تێ دەگا دەتوانێ بەم زانستە هەموو رووداوێکی دونیا بزانێ.
**جەلال:** شکۆمەند.
**جەمال:** جوانی، سپەهی.
**جەللاد:** کوژەك، پیاو کوژ، میرغەزەب، ئەوەی جەلدە لە گوناهکاران دەدا.
**جەنبە:** لایەن.
**جەننەت(جنة):** بە هەشت، باخچەو بەراو.
**جەور:** ستەم، زۆرداری.
**جەولانگاە:** جێی گەڕان و سووڕان.
**جەیش:** سوپا، لەشکر.
**جیبال،** کۆی(جبل)ـە: چیا، کێو، شاخ، کەژ.
**جورعە(جرعة):** قوم، فڕ.
**جوملە:** گشتی.

**جنبش:** جووله، وه‌رار، بزاڤ.
**جوهد(جهد):** ته‌قه‌للا، هه‌وڵ.
**جیسم:** له‌ش، ته‌ن.
**جیفه:** لاك، كه‌لاك، كه‌له‌ش، لاشه‌ی وڵاغی مردار.

((چ))

**چاك:** باش، دڕاو، هه‌لڕژاو.
**چاكه‌ر:** نۆكه‌ر، خزمه‌تكار.
**چاه:** چاڵ، بیر، قۆرت.
**چه‌تفه:** تیلاك، پۆته‌لاك، چه‌فیه‌ی زل.
**چه‌پگه‌رد:** ئه‌وه‌ی به پێچه‌وانه‌ی مرادی مرۆ ده‌سووڕێ.
**چه‌لیپا:** سه‌لیب.
**چه‌هره:** چاره، روخسار، ده‌م و چاو.
**چراغ:** چرا.
**چه‌نگ:** جۆره ئامێرێكی مۆسیقی ژێداره، چه‌پۆك.

((ح))

**حازیق(حاذق):** وریاو شاره‌زا، لێزان.
**حاشیه:** په‌راوێز.
**حه‌چی(حكی):** قسه.(خۆش حه‌چی: قسه‌ی چاكه)
**حه‌زه‌ر(حذر):** وریایی، ئاگاداری.
**حه‌سحه‌س:** نۆبه‌تداری شه‌و.
**حه‌سره‌ت:** داخ، كه‌یبه‌ر، كوڤان.
**حه‌قاره‌ت:** په‌ستی، نزمی، چرووكی، بێقیمه‌تی.
**حه‌مامۆك:** سه‌رچاوه‌یه‌كه ده‌كه‌وێته بناری باواجی و باكووری رۆژئاوای شاری كۆیه.

**حەڵقە لە گۆش:** حەڵقە لە گوێ، بەندە، کۆیلە.کاتی خۆی بەندە(عەبد) حەڵقەی لە گوێ دەکرا بۆ ئەوەی پێ بناسرێتەوە.
**حەلیم:** نەرم و لەسەرە خۆ، بێ وەی.
**حەمال:** حەمباڵ، باربەر، کۆڵهەڵگر.
**حەوادیس(حوادث)**، کۆی(حادثە)یە: ڕووداو، بوویەر، بەسەرهات.
**حەواس(حواس)**:، کۆی(حاسة)یە: هەست.
**حەی(حیّ)**: زیندوو، خێڵی مەجنوون.
**حوور:** پەری.
**حوسن:** جوانی، چاکی.
**حیرقەت:** سووتانەوە.
**حیرەت:** واق و ڕمان، سەرسوڕمان، حەپەسان، مەندەهۆشی.
**حیشمەت:** شەرم، حەیا، گەورەیی.

((خ))

**خائین:** ناپاك.
**خاترجەم:** دڵنیا، ئارخەیان، بێخەم.
**خاتیمە:** کۆتایی، دوایی.
**خار:** دڕك، چقڵ، ستری.
**خاکستەر:** مشکی، خۆڵەمێش، بووڵی.
**خاڵخاڵان:** چیایەکە لە ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی تەق تەق، لەوبەری ڕووبارەکە. گوندێکیش لە بناری چیاکە هەیە هەر بەو ناوەوەیە.
**خامە:** قەلەم، پێنووس.
**خەتا:** تاوان، سووچ. شاری خەتا کە لەگەڵ خوتەن هەمیشە بە یەکەوە دێن(خەتا و خوتەن) کەوتۆتە تورکستانی ئەفغانستان.
**خەتەر:** مەترسی.
**خەجاڵەت:** شەرمەزاری، تەریقبوونەوە.
**خەدەنگ:** تیر.

**خەرابات:** مەیخانە، وێرانە، کاول، شوێنی ئافرەتی خراپ، شوێنی گرتنی شیلەی تریاك، لای سۆفییەکان شوێن و پلەی گوێ نەدانە بە نەریت و ڕەوشتی باوی کۆمەڵ.
**خەرقە:** یان غەرقە، غەرگە: سەربەرگێکی دەروێشانەیە، بێ قۆڵە، تا کەمەر دێ، پینە پینەیە.
**خەرامان:** لەنجەو لار.خەریدار: کڕیار.
**خەستە:** نەخۆش(خەستەخانە: نەخۆشخانە)، شەکەت و ماندوو.
**خەلیل:** هاوڕێ، برادەر.
**خەواس(خواص):** سەردەستە، تاقمی پایە بەرزو دیار.
**خەیرولئەنام(خیرالانام):** باشترینی خەڵك، مەبەست پێغەمبەرە.
**خەیرولبەشەر(خیرالبشر):** باشترین مرۆڤ، مەبەست پێغەمبەرە.
**خەیلێ:** زۆر، گەلەك، زەحف.
**خەییات(خیّاط):** بەرگدروو، دروومانکەر.
**خومار:** سستی و خاوی دوای ڕەها بوون لە کاریگەری خواردنەوەی شەراب.واتە حاڵەتی پاش مەستییە.
**خوب:** چاك، باش.
**خودبین:** خۆپەرست.
**خولد:** بەهەشت.
**خویش:** خزم.
**خیتاب(خطاب):** گوتار.
**خیلعەت(خِلعة):** بەرگێکی درواوە پیاوێکی گەورەی دینی یان دنیایی وەکو ڕێز لێنان دەیکاتە دیاری بۆ کەسێ و لەبەری دەکات، خەڵات.

((د))

**دارولحەزەن(دارالحزن):** غەمخانە، خەفەتخانە، ئاماژەیە بۆ ژوورەکەی حەزرەتی یەعقووب.
**دەر:** دەرگا، دەرگە، دەرکە.
**دەعبا:** ئاژەڵی دڕندە.
**دەغەڵ:** لەڕ و لاواز.

**دەفعە:** جار، چەل، تاو، هەل.
**دەقولباب(دق الباب):** لە دەرگەدان، دەرگە قوتان.
**درەخشان:** بریقەدار، ترووسکەدار، درەوشانەوە.
**دوختەر:** دختۆر، پزیشك، (بە فارسی واتە: کچ).
**دوڕ:** مرواری درشت، دوڕی یەتیم: مرواریەکی گەورەیە بە تەنیا لەناو یەك قەپێلك دا دەبێ. مرواری بێ وێنە.
**دوڕدانە:** دانە مرواری.
**دوڕئەفشان:** بلاو کردنەوەی مرواری، درکەیە لە گریان کە فرمێسکەکەی وەکوو مرواری روون و پاکە.
**دوعا گۆ:** ئەوەی دوعای خێرو چاکە بۆ خەلك دەکا.
**دلارا:** مایەی شادی و کرانەوەی دل، دلخواز، دلبەری جوان، خۆشەویست.
**دلفرێن:** دلبەر، دلکێش، جوان و نازدار.
**دلنەواز:** دلخۆشکەر، دلپەسند، دلگر.
**دۆشکە:** چەکێکی شەڕە بە شێلکە دەهاوێژرێ. گوللەی لە گوللەی تفەنگ گەورەترە.
**دیرایەت(درایة):** تێگەیشتن.
**دیعایە:** بانگەشە، پڕوپاگەندە.
**رابیتە:** هات و چۆ.
**رایحە(رائحة):** بۆن.
**رەئووف:** میهرەبان، بە بەزەیی.
**رەب:** خودان، خودا، ماخۆ.
**رەباب:** ئامێرێکی مۆسیقی کۆنە، وەکوو تار وایە بەلام کاسەکەی بچووکترە، تەنیا دوو ژێی هەبووە(دوو تار).
**رەخشان:** درەخشان، روناك، گەش و تروسکەدار.
**رەزیل:** چرووك، بەخیل، رژد، چاوتەنگ، خنس.
**رەعنا:** کچی خۆپەرست و خۆ ویست و نەزان، بەمانای خۆش قەد و قامەتیش هاتووە.
**رەعیەت:** رەشەوەندی خەلك.
**رەغم:** رەفتار کردن دژی مەیلی کەسێ.
**رەفرەف:** بەرگ و رایەخی نازك و جوان، فەرش، رایەخ. پەیکی رەفرەف: نامەبەری خۆشڕۆ.

**رەقس(رقص):** سەما، هەڵپەڕکێ، داوەت، سوور.
**رەقیب:** چاودێر، پاسەوان، دووکەس کە عاشق و ئارەزوومەندی یەك کەس یان یەك شت بن، هەریەکە رەقیبی ئەوی دیکەیە، چونکە هەمیشە چاودێری دەکا بزانێ چ دەکا و چ ناکا.
**رەقیم:** نووسراو.
**رەمل:** قو زانستێکە بۆ زانینی شتی نەپەنی بە هۆی کێشانی هێلی جۆراوجۆرلە سەر قوم.
**روئیەت:** دیتن.
**روحپەروەر:** ئەوەی گیان پەروەردە دەکا و پێی دەگەیەنێ.
**روخ:** روو.
**ریاسەت:** سەرۆکایەتی.
**ریحلەت:** کۆچ، مشەخت.
**ریش:** برین، زام.

((ز))

**زال(ضالّ):** گومڕا، وێل، سەرگەردان.
**زاهید:** خواپەرست، ئەوەی دونیا تەرك دەکا لە پێناوی قیامەت.
**زایرجە:** (زایچە)شی پێ دەگوترێ تابلۆیەکی چوارگۆشە یان بازنەییە بۆ پێشاندانی شوێنی ئەستێرەکان لە گەردوون دروست دەکرێ و بۆ وەرگرتنی بەختی لەدایکبوون (زایش)و شتی تر سەیری دەکەن. زایچە لە زایشەوە هاتووە.
**زەبیال:** زبڵڕێژ.
**زەبت(ضبط):** بەرزەفت کردن، دەسەڵات بەسەردا گرتن.
**زەبوون:** عاجز و مەلوول، کلۆڵ، کەسیرە، عەبایەکی تەنکە بەسەرشانی دادەدەن.
**زەجر:** شکاندنەوە، بەسەردا ڕۆیشتن.
**زەخم:** برین، زام.
**زەخیرە:** ئازووقە، بەرەم.
**زەدە:** پێکراو، ئەنگێوراو.
**زەلامەت(ظلامت):** تاریکی، تاریی.

**زەللە(ضلّ):** ڕێی گوم کرد، وێل بوو.
**زەمزەمە:** دوعای خۆشووشتن و نان خواردنی زەردەشتیانە.
**زەمیمەت(ضمیمە):** پاشکۆ.
**زەنەخ:** چەناگە.
**زەهرا(فاطمة الزهراء):** کچی پێغەمبەر و خێزانی عەلی و دایکی حەسەن و حوسێنە.
**زەهراب:** ژەهراو.
**زولجەناحەین(ذوالجناحین):** دووباڵی.
**زولفەقار(ذوالفقار):** ناوی شمشێری ئیمامی عەلییە، کە سەری دووفلیقانە بوو.
**زولقوربا(ذوالقربی):** خزم.
**زومرە:** تاقم، گرۆ.
**زولال:** سازگار، ڕوون.
**زیا(ضیاء):** ڕوناکی.
**زیبا:** جوان، سپەهی.
**زیج:** خشتەیەکە جوولانەوەی هەسارەکان پیشان دەدا.
**زیدد(ضدّ):** دژ، پێچەوانە.
**زیندەگانی:** ژیان.

((س))

**ساحیب:** خودان، خاوەن، ماخۆ، خێو.
**سادیرە:** (صادرة): دەرکردە.
**ساقی:** مەیگێڕ.
**سامری:** کابرایەکی خەڵکی(سامرە)بوو، جادووگەر بوو، لە سەردەمی حەزرەتی مووسا بوو، کە داوای کرد گوێرەکە بپەرستن.
**سەبا(سبأ):** شاری(سەبا) لە یەمەن.لە زەمانی حەزرەتی سلێمان بەلقیس پاشایەتی دەکردن. چیرۆکی حەزرەتی سلێمان و پەپو سلێمانەو بەلقیس لە قورئاندا هاتووە.
**سەبا(صبا):** کزەبا، شنەبا، شیبا، بایەکە لەلای باکووری ڕۆژهەڵاتەوە دێ بایەکی خۆش و فێنکە، یەکێکە لە (٢٤)بەشی مۆسیقای ئێرانی(٥) ئاوازە.

**سەبات(ثبات):** جێگری، خۆڕاگری، سەقامگیری.
**سەتوەت(سطوة):** باڵادەستی، دەستدرێژی.
**سەجدەکونان(سەجدە + کون + ان):** بە کڕنۆش بردنەوە(ظرف حالت).
**سەح(صح):** راست، دروست.
**سەحەرخیز:** ئەوەی بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستیٚ.
**سەحرا(صحراء):** بیابان.
**سەدارەت(صدارت):** پێشەنگی.
**سەدەف(صدف):** گیان لەبەرێکی بچووکە لە ئاودا دەژی، لەشی دەچێتەوە ناو قەپێلك، پێی دەگوترێ(صدف). چەند جۆرێکی هەیە.لە هەموویان بەناوبانگتر سەدەفی مرواریییە کە ماددەیەك لەناو خۆیەوە دروست دەکا وردە وردە وەکوو بەردی لیٚ دیٚ و دەبێتە مرواری.
**سەرەفگەندە:** سەرشۆڕ، چاو بەرەژێر، شەرمەزار.
**سەعدوسسعوود(سعد السعود):** بەختی بەختان، دوو ئەستێرەن لە یەك ڕووناکترن. بەرەبەری بەیانی هەڵدێن مژدەی هاتنی بەهارو خۆش بوونی هەواو شین بوونی رووەکن.
**سەعی:** هەوڵ و تێکۆشان.
**سەفا(صفاء):** پاکی، روونی، رەونەق، خۆشی و شادی، شوێنێکە لە مەککە لەگەڵ (مەروە) ئەوەندە لێك دوور نین، سەفاو مەروەکردن یەکێکە لە دابەکانی حەج.
**سەفاخواە:** خۆشی خواز.
**سەحفە(صەحیفە):** لاپەڕە.
**سەفشکێن:** ئەوەی سەفی دوژمن دەشکێنیٚ، ئازاو چاونەترس و نەگەڕاوە.
**سەما:** هەڵپەڕکیٚ، داوەت، گۆوەند.
**سەما(سماء):** ئاسمان.
**سەمیع:** بیسا، بیسەك، ئەوەی زۆر و باش شت دەبیسیٚ.
**سەمیی(سمّی):** هاوناو، بەرشی.
**سەناخوان(ثنا + خوان):** پیا هەڵدەر.
**سەنعەت:** پیشە.
**سەواب(ثواب):** پاداشت.
**سەواب(صواب):** راست و دروست.

**سەیل:** لەهی، لێمشت، لافاو.
**سەیلاب:** سێلاو، لافاو.
**سەییاد(صیّاد):** راوکەر، راوچی، نێچیروان.
**سەلیم:** ساخ، زۆرجار لەگەڵ (ساغ) بەیەکەوە دێن(ساخ و سەلیمە).
**سەییاح(سیّاح):** گەڕیدە، گەڕاڵ، گەڕۆك.
**ستەم:** زوڵم و زۆر، بێدادی، غەدر.
**ستەمدیدە:** ئەوەی زۆرو ستەمی بەسەرهاتووە، زۆر لێ کراو، زوڵم لێ کراو، ستەم لێ کراو.
**سپەند(اسپند، اسفند):** گیایەکی خۆڕسکە دانەکەی وردو رەشە بۆ چاکردنەوەی برینی چاو دەیخەنە ناو ئاگر. بۆنێکی تایبەتی هەیە لای هەندێ کەس خۆش و پەسەندە.
**ستران:** گۆرانی.
**سرشك:** فرمێسك، رۆندك، ئەسرین.
**سفرە:** خوان.
**سکتر:** بێدەنگی.
**سککە:** پارەی ئاسن، دراو.
**سن :** جۆرە گیاندارێکی بچووکە لەکاتی پێگەیشتنی گەنم دا پەیدا دەبێ و ساڵی وا هەیە زۆرەو گەنم ناهێڵێ.
**سوبح(صبح):** بەیانی، سپێدە.
**سوپەر:** قەڵغان، مەتاڵ.سپێر، چەپەر، سەنگەر.
**سۆجەر(soldier):** سەرباز.
**سورەییا(ثریّا):** پێروو، کۆمەڵە ئەستێرەیەکن بە دەوری یەکەوە.
**سوزان:** لە سووتان.
**سۆفار:** پەڕی سەری تیر.
**سوڵح(صلح):** ئاشتی، تەبایی، پێك هاتنەوە.
**سیاه:** رەش.
**سیەه چارە:** چارە ڕەش، بەدبەخت، بێ ئیغباڵ.
**سیرات(صراط):** رێگا.
**سیراج:** چرا، مەشعەل، مەشخەڵ.
**سیك:** سەربازی هیندی.

**سونبول:** هێشووی گەنم و جۆ.گیایەکە لە شوێنی تەڕ دەڕوێ گەڵای درێژ و گوڵی بچووک و بۆنخۆشە، تا مەترو نیوێك بڵند دەبێ.

((ش))

**شاتری:** شاگردی.
**شافی:** چارەساز.
**شام:** ئێوارە، نانی ئێوارە، وڵاتی شام(سوریا).
**شاه و فەرزین:** شاو سەرباز(مەلیك و جوندی) لە یاری شەترەنجدا.
**شەئن:** کاروبار، نرخ و پایە، بێ شەئنی، بێ نرخی.
**شەباب:** گەنج، لاو، تولاز، خورت.
**شەرحی سینە:** توێ توێ کردنی سینگ، ئاماژەیە بە ئایەتی (ألم نشرح لك صدرك).
**شەرع:** ڕێباز و ڕەوشتی ئایینی کە خوا بۆ بەندەکانی خۆی دیاری کردووە.
**شەفاعەتخوان:** ئەوەی بۆ خەڵك دەپاڕێتەوە، دوعاکەر، دوعاگۆ.
**شەفیع:** شەفاعەتخوان، دوعاکەر، دوعاگۆ.
**شەرمەسار:** شەرمەزار، سەرشۆڕ.
**شەرمەندە:** شەرمەزار.
**شەمس:** ڕۆژ، خۆر.
**شەوخیز:** ئەوەی شەو بۆ خوا پەرستی هەڵدەستێ(قائم الليل) .
**شەوکەت:** دەسەڵات، شان و شکۆ.
**شەهد:** هەنگوین.
**شەهسوار:** شاسوار، شۆڕەسوار، سواری عەگید.
**شتاب:** پەلە، بەلەز.
**شترید(ای + شیء + ترید):** چت دەوێ؟
**شتگول(ای + شیء + تقول):** چ دەڵێی؟چ دبێژی؟
**شروح**، کۆی(شرح)ـە: راڤە، لێکدانەوە، ڕوون کردنەوە.
**شرینقە:** دەرزی دەرمان لێدان.
**شکارەنداز:** راوچی، راوکەر.

**شمقاڕ:** باڵندەیەکی لەش باریکەڵەو باڵ درێژو کووڕەکەیە، کلك و لاقی درێژە، دندووکی زۆر ئەستوور نییە. بەنزمی دەفڕێو لەکاتی فڕیندا باڵی نەختێ قیت دەکاتەوە، نێرو مێی ڕەنگیان جودایە، بە زۆری نێرەکە لە مێیەکە بچوکترە. هێلانە لەسەر زەوی و لەناو قامیشەڵان دەکا. جۆری زۆرە وەکو:

شمقاڕی بۆر، شمقاڕی سپی، شمقاڕی زەلان، شمقاڕی گەنمان.

**شوعبە:** لق، تا، چڵ.

**شوهرەت:** ناوبانگ.

**شیرك:** هاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا.

**شیشە:** شووشە، شیشەی ئاسن.

**شیعار:** دروشم.

**شیقاق:** دووبەرەکی، ناکۆکی.

((ع))

**عار:** شورەیی، فهێتی، شەرمەزاریی.

**عاسیمە(عاصمة):** پێتەخت.

**عەتتار(عطّار):** وردەواڵە فرۆش، لە بنچینەدا بە بۆن و بەرامە فرۆش هاتووە.

**عەتیق:** دێرین، کۆن، کەونارا.

**عەجز:** پەك کەوتن، لەکار کەوتن.

**عەدوو:** دوژمن، نەیار، ناحەز.

**عەرش:** تەختی حوکمڕانی.

**عەزم:** ئیرادە، ویست.

**عەقرەب:** دووپشك.

**عەقیق:** بەردێکی گرانبەهایە ڕەنگی جیا جیای هەیە.هەرە باوو پەسەندەکەیان ڕەنگی سوورە. جۆرێکی بە عەقیقی یەمەنی یان یەمانی ناسراوە. عەقیق بە زۆری دەکرێ بە نگینی ئەنگوستیلە.

**عەلامەت:** نیشانە.

**عەلیل(علیل):** نەساخ، نەخۆش، دەردەدار.

**عەمامە:** مەندیل.
**عەمیق:** قووڵ، کویر.
**عیناد:** لامل، کەللە ڕەق، کەللەشەق، رقەستوور، کانێسەستوور.
**عەوام:** رەشەوەندی خەڵك.
**عەودال:** هەڵوەدا.
**عەون:** یارمەتی، هاوکاری، باروبوو.
**عەیش:** ژیان.
**عەییار:** زۆر هات و چۆکەر، بەرەللا، تەڕدەست، زرنگ، مرۆڤی چالاك و بەبەز، زۆرزان.
**عوبوودییەت(عبودیة):** بەندایەتی، کۆیلایەتی.
**عوجب:** لووتبەرزی، خۆپەرستی، دەعیە گەورەیی.
**عوود:** داری وشك، ئامێرێکی مۆسیقی پێنج ژێیە.
**عورف:** نەریت، ڕەوشت.
**عوززا(عزّا):** بتێکی قورەیشیان بوو پێش هاتنی ئیسلام.
**عوسر(عُسر):** تەنگانە، ناخۆشی.
**عوقبا:** پایان و کۆتایی، ئاخیرەت، ڕۆژی پەسلان.
**عولیا:** بەرز، بڵند.
**عومر:** تەمەن، ژی.
**عیشرەت:** دۆستێنی، برادەراتی، تێکەڵی، هاوڕێتی، خوشگوزەرانی.
**عیشوە:** نازوکریشمە.

((غ))

**غارەت:** پەلامار، هێرش، هەڵکوتانە سەر.
**غەرقە:** خەرقە، غەرگە.
**غەریق:** خنکاو، لە ئاو نقووم بوو.
**غەزەلخوان:** غەزەلبێژ، غەزەلگۆ، غەزەلنووس. غەزەل: شیعرێکە بە ئافرەت هەڵدەڵێ و هەست و سۆزو خۆشەویستی شاعیر بەرامبەر گراوییەکەی دەردەبڕێ.
**غەمزە:** نازو کریشمە، چاوو برۆ هەڵتەکاندن.

**غەمزەدە:** غەمگین، غەموون، غەمناك، خەفەتیار، پێکراوی غەم.
**غەنی:** دەوڵەمەند، ساماندار، هەبووە.
**غەوواس(غوّاص):** ئەوەی دەچێتە ژێر ئاو.

بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ئەمما
(غەوواسی)دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە
(نالی)

**غەوغا:** ئاژاوە، گێرەشێوێنی، پشێوی.
**غوسسە(غصّة):** غەم و خەفەت، مەینەت.
**غوفران:** لێ بوردن، لێ خۆش بوون.
**غیلمان**، کۆی(غلام)ـە: رواڵ، منداڵی لووسکە.

((ف))

**فائیدە:** سوود، مفا، قازانج، کەلك.
**فاروق:** جیاکەرەوەی هەق و ناهەق، نازناوی عومەری کوڕی خەتتابە.
**فەتح:** کردنەوە، رزگارکردنی شارێك یان وڵاتێك لە نەیاران.
**فەتل:** بادان، لوولدان.
**فەخرولئەنام:** جێی شانازی خەڵك، مەبەست پێغەمبەرە.
**فەرەح:** شادی، خۆشی.
**فەرقەدان**(فرقدان_تاکەکەی: فرقد): ناوی دوو ئەستێرەی نزیك تەوەری باکوورە.
**فەرش:** رایەخ.
**فەریاد:** هاوار.
**فەزل(فضل):** چاکە.
**فەزەع:** ترس، بیم، هەراسانی، تۆقان.
**فەساد:** گەندەڵی.
**فەسحەت(فصحة):** زمانپاراوی.
**فەغان:** هاوار، بانگ و فریاد، ناڵە.
**فەنتازی:** خەیاڵاوی، ئەندێشەیی.

**فەوتی بکا:** لە ناوی بەرێ، بیفەوتێنێ.
**فتوا:** حوکم و رای پسپۆری ئایینی بە پێی دەستووری ئیسلام.
**فدێ:** قوربانی.
**فروزان(دلفروزان):** روشنکەرەوە، درەخشان، تیشکدەر.
**فرمێسك:** سرشك، رۆندك، ئەسرین.
**فریب:** فریو، تەفرە، خاپاندن، لەخشتە بردن، هەڵخەڵەتاندن.
**فنیش(finish):** لەکاردەرکردن.
**خەجوول:** شەرمن.
**فورسەت(فرصة):** هەل، دەرفەت.
**فیسق:** دەرچوون لە فەرمانی خودا، لادان لە رێی حەق و چاکە، کاری پیس و ناڕەوا.
**فیلحەقیقە(في الحقیقة):** لە راستیدا، راستییەکەی، بەراستی.
**فیلمەسەل(في المثل):** بە نموونە، میناك.

((ق))

**قابەقەوسەین(قاب قوسین):** بەقەدەر دووکەوان.
**قابیز(قابض):** چنگ لێ گیرکەر، عزرائیل، پێمێرد.
**قاتیل:** کوژەك، بکوژ، پیاوکوژ، خوێنرێژ.
**قازی(قاضی):** دادوەریی ئایینی.جێ بە جێ کەر(قاضی الحاجات: ئەوەی پێویستی خەڵك جێ بە جێ دەکا، واتە خوا).
**قاسیر(قاصر):** بێ توانا، کەم دەسەڵات، ئەو منداڵەی نەگەیشبێتە تەمەنی بالق بوون.
**قاقنەس یان قەقنەس:** تەیرێکە گوایە کە کاتی مردنی دێ هەندێ پووش و پەڵاش کۆدەکاتەوە سەریەك و جۆش و خرۆشێك دەیگرێ و دەکەوێتە حاڵ و لە عیشقی خۆی ئاگر لە پووش و پەلاشەکە بەردەدا و هەر بەو ئاگرەش دەسووتێ و پاشان لە ناو خۆڵەمێشی ئاگرەکە ئێسك و پرووسکی سووتاوی دووبارە زیندوو دەبێتەوە و دەبێ بە قەقنەسێکی تازە.ئەمە نوێ کردنەوەی دەورەی ژیانی ئەم باڵندەیەیە کە ڕەمزی نەسووتانە بە ئاگر.
**قامك:** پەنجە، ئەنگوست، تلك، تلی، تبل.

**قاوەڵتی:** خواردنێکی سووکە پێش جەم، بە تایبەتیش بەو شتە دەگوترێ کە بەیانی لە خورینی و پێش ئامادە بوونی تێشت دەخورێ.
**قەتل:** کوشتن.
**قەپات کردن:** داخستن، پێوەدان، گرتن.
**قەدەح:** پەرداخ.
**قەدر:** نرخ، توانا، فەرمانی خوایی، چارەنووس.شەوی قەدر کە یەکەم جار قورئانی تێدا هاتۆتە خوارێ.
**قەزا(قضاء):** حوکم کردن، تەقدیری خودا دەرحەق بەندەکانی خۆی، مردن، وەکوو زاراوەیەکی ئایینی نوێژێك یان رۆژوویەك یا هەر واجیبێکی دیکەیە کە لەکاتی دیکەدا بکرێ.
**قەزبێن(قەزوێن):** ئەو شمشێرە بوو کە لە شاری قەزوین دروست دەکرا.
**قەسوەت:** توندوتیژی.
**قەڵا(قلعة):** کەلا، کەلەه، کەلات.
**قەلغان:** ئامێرێك بوو وەکو سێڵ خڕو ناوەندی بەگۆ بوو و دەسکی پێوە بوو، لە پۆڵا دروست دەکرا، شەڕکەر لە مەیدانی شەڕلەشی خۆی پێ لە زەبری تیر و شمشێر و گورزی نەیارەکەی دەپاراست.
**قەڵفەت:** قولفە: ئەڵقەیەکی خڕە لەپەت، مەودای فراوان بوون و تەسك بوونەوەی هەیە. قەڵفەت بە مانای قەلافەتیش هاتووە، واتە قەدو قامەت.
**قەناعەت:** رازی بوون بە بەشی خۆ، رازی بوون بە شتی کەم، قنیات.
**قەوم و قیل:** خزم و خویش.
**قەیسەر(قیصر):** نازناوی پاشاکانی رۆم بوو، قڕاڵ.
**قەیسەران:** ناوی ئاوازێکی مۆسیقی کۆن بووە.
**قوباد:** پاشایەکی ئیرانی بوو.
**قوببە:** گومەز، گومبەت.
**قولاب:** چەنگاڵ.
**قوتب:** تەوەرە، پستەی ئاش، هەردوو جەمسەری گۆی زەوی (باکوور و باشوور)، پیرو ڕێبەری ئایینی کە پەیڕەوکەری خۆی هەبێ.
**قودرەت:** توانا و دەسەڵات، قەزاوقەدەری خوا(ئاگری قودرەت).

**قوماندان(commander):** سەرکردە، فەرماندە.
**قوون تلوور:** قوون خڕ کە لە هیچ شوێنێ تۆتکە نەگرێ.
**قیتال:** شەڕ، جەنگ.
**قیتمیر(قطمیر):** پەردەیەکی ناسکە لە بەینی خورما و ناوکەکەی، درکەیە لە شتی کەم و بێ‌نرخ، سەگی یاوەرانی ئەشکەوت(اصحاب الکهف).

((ك))

**کائینات،** کۆی(کائن)ـە: بوونەوەر، ئەوەی کە هەیە.
**کاسب:** ئیشکەر.
**کافر:** ئەوەی نکوولی خوا دەکا.
**کەپتان(captain):** سەردەستە.
**کەبك:** کەو.
**کەدەر:** شلوێ، شێلو، تاریکی، ڕەنگی تار، تاری و ناخۆشی ژیان.
**کەریم:** بەخشندە، دەست و دڵ کراوە.
**کەرامات،** کۆی(کرامة)یە: قسەو کردەوەی نائاسایی کە لە توانای مرۆڤی ئاساییدا نەبێ و تەنیا بە پیاوی دیندار بکرێ.
**کەسکوون:** تیژ.
**کەساد:** بێ‌ڕەواجی، بێ‌بازاڕی.
**کەسیرە:** زەبوون، زۆر کەشەنگ و ماندوو.
**کەششاف:** دۆزەرەوە، ناوی تەفسیرە بەناوبانگەکەی(زمخشری)یە.
**کەشکۆل:** دەفرێکە دەروێشی ماڵانگەڕ بە ملی وە دەکا، یان بەسەر باسکی دادەدا و لە تفری میوەیەکی وەکوو(نارگیل) دروست دەکرێ کە لە هیندستان هەیە، لە ئاسن و سوالەتیش دروست دەکرێ. ئەو شتانەی لە ماڵان وەری دەگرێ هەمووی بە تێکەڵ و پێکەڵی لەو کەشکۆڵە دەکا.
**کەللە:** کاپێل، جومجومە.
**کەمەربەستە:** ئەوەی دامێنی لەبەر کەمەری راکردبێ و ئامادەی کارو خزمەت بێ. درکەیە لە نۆکەری ئامادەی خزمەت.

**کەمەند:** پەتێکی درێژە بۆ گرتنی کەسێ یان گیانداریێ بە کاردێ، بۆ بەسەر دیوارو خانوو هەڵگەڕانیشدا بەکاردێ.کاتی خۆی پاڵەوانەکان لەشەڕدا بەکاریان دەهێنا بۆ گرتن و ڕاکێشانی ناحەزەکەیان.
**کەلیم:** پڕبێژ، ئاودەنگ، هەمنشین، قسەکەر، درکەیە لە حەزرەتی مووسا کە هەموو ڕۆژێ دەچووە سەر کێوی توورو قسەی لەگەڵ باری تەعالا دەکرد.
**کەنناس:** گەسکدەر.
**کەوە:** ئاماڵ شین، (کەوە ڕۆژ) ئەو ڕۆژەیە کە هەورێکی تەنکی لەبەرە و دونیا مەیلەو شین دەچێتەوە، چیوەی بێژینگ و سەرەند و هێڵەگ.
**کەوکەب:** ئەستێرە.
**کەید:** فێڵ، حیلە، دەك و دەهۆ، مەکرو دۆلاب.
**کۆ:** کۆمەڵە ئەستێرەیەکی وردە وەکوو تۆپ خڕ بوونەتەوە سەر یەك.
**کوس:** تەپڵ:
پوس کوس گوش نم کێشا کەم کەم
ئەم سەر ئەو سەرەن دووربینەکەی چەم
(مەولەوی)

**کلوور:** سەدهەزار.
**کوند:** کوندە بۆ، پەپوو.
**کیسەڵە:** گیاندارێکی بچووکە لەکاتی پێ ڕاگەیشتنی گەنم پەیدا دەبێ و لەسەر شیلەی گەنم دەژی. (سن و کیسەڵە) بەزۆری بەیەکەوە دێن.
**کێشکە:** چۆلەکە، پاساری، سواندووکە، مەلووچك.
**کینەوەر:** زگڕەش، خەشمانکێش، کانێسە ستوور.

((گ))

**گەنج:** لاو، خورت، تولاز، گەنجینە.
**گوزەرگا:** ڕێڕەو.
**گوش:** گوێ، گوێچکە، گوھ.
**گوشاد:** کراوە، والا.
**گوشوارە:** گوارە.

**گوڵشەن:** گوڵزار.
**گوڵعوزار:** رووگوڵ.
**گوڵاڵە:** لاڵە، گوڵێکی چوار پەلکەیە، رەنگی پەلکەکانی سوورە و ناوەڕاستیان رەشە لە مانگی نیسان دەڕوێ.
**گومراه:** گومڕا، وێل و سەرگەردان، هەڵەتە.
**گومگومە:** دەفرێکی ئاسنینی مل درێژە ئاوی تێدەکرێ، بە مەتاڵەش دەگوترێ.
**گوێزەبانە:** ئاهەنگی خۆشی لە دایکبوونی کوڕ.
**جێت(جئتُ):** هاتم.
**گێج:** گێژو وێژ، وڕوکاس.

((ل))

**لات:** هەژار، نەبووە، زۆر دەستکورت.ناوی بتێك بوو پێش ئیسلام(لات و عزّا).
**لاتەقرەبوو(لاتقربوا):** نزیك مەبنەوە، تخوون مەکەون.
**لاتەقنوتوو(لاتقنطوا):** نائومێد مەبن، هەناسەسارد مەبن.
**لاف:** خۆ هەڵکێشان، خۆ بە زلزانین، بە خۆدا هەڵگوتن.
**لایەزال(لایزال):** ئەوەی هەر دەمێنێ و لە ناو ناچێ، مەبەست خوایە.
**لایق:** شیاو، شایەن.
**لامەکان(لامکان):** بەبێجێ، مەبەست خوایە.
**لەئیم:** ناکەس بەچە، نزم و پەست، قین لە دڵ.
**لەبالەب:** لێواو لێو، لێوڕێژ.
**لەززەت:** چێژ، تام و بۆ.
**لەعل:** بەردێکی بەهادارە رەنگی سوورە وەکوو یاقووت وایە.لەعلی بەدەخشان زۆر بەناوبانگە. لەعلی موزاب درکەیە لە شەرابی سوور.
**لەعین:** نەفرەت لێ کراو، تووك لێ باریو، ترۆ کراو.
**لەن تەرانی(لن تراني):** قەت نامبینی.
**لەولاك (لولاك):** ئەگەر تۆ نەبای. (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك).

**لیوا:** بەشێکی دابەش بوونی سەربازی سەردەمی عوسمانی بوو، ژمارەی سەربازەکانی بە(١٠٠٠) کەس داندرا بوو. پارێزگا.

((م))

**ماچین:** کورت و سووك کراوەی(مەهاچین)ـە واتە چینی گەورە، چینی ڕەسەن، چینی تایبەتی. لە ڕۆژگاری کۆن چین بە شارەکانی نزیك کاشگەرو خوتەن دەگوترا.
**مادون:** نزمتر، کەمتر.
**ماسەلەف:** ئەوەی ڕۆیشت، تێپەڕیو.
**مانی:** لەسەردەمی شاپووری یەکەم بووە، داوای پێغەمبەرایەتی کردووە، کتێبێکی هەیە بە ناوی (ئەرژەنگ)، ئایینەکەی لە زەردەشتی و جوولەکەیی و دیانی تێکەڵ بوو.
**ماه:** مانگ، هەیف. ماهی کەنعانی: درکەیە لە یووسفی کوڕی یەعقووب کە نموونەی هەرەجوانی مرۆڤە.
**مەئلووف:** باو.
**مەئموول:** بە هیوا، ئومێدەوار.
**مەئویس(مەئیوس):** نائومێد، هیوا بڕاو، ئەم پاش و پێش کردنی (و، ی)یە لە کوردیدا لە زۆر وشەی دیکەدا دەردەکەوێ وەکوو:
ملیۆن --> ملوێن، رادیۆن--> رادوێن.
**مەتن:** دەق.
**مەجلیس:** کۆڕی دانیشتن.
**مەحز(محض):** شتی خوڕ و پاك و بێ تێکەڵی هیچ شتی دیکە، تایبەتی،
بەمەحزی: هەرلەگەڵ ئەوەی کە...
**مەحسەل(محصل):** دەستکەوت.
**مەحشەر(محشر):** ڕۆژی زیندوو کردنەوە و حیساب کردن لەگەڵ خەڵك.
**مەحفوور:** مافوور.
**مەحوو:** لەناو چوون، مەحف(مەحف بووەوە).
**مەخدووم:** خزمەتکراو، پیاوی گەورەی خاوەن نۆکەر.
**مەد:** درێژکردنەوە، لێك کێشانەوە.

**مەدداح(مدّاح):** پیّ هەڵگۆ.
**مەرتەبە:** پایە.
**مەرجان:** گیائلەبەرێکی دەریاییە وەکوو گیاوایە بە زەوییەوە دەنووسێ.لە زەمانی کۆن نەیاندەزانی ئەمە گیانلەبەرە، هەروایان دەزانی گیای دەریاییە. جۆرێکی هەیە سوورە وەکوو گوڵ وایە لەسەر قاتۆر وەستاوە. مەرجان لە گەوهەرکاریدا بەکاردێ. خشل و شتی گرانبەهای لیّ دروست دەکەن. هەندێ جار مەرجان بە ئەندازەیەکی زۆر لە یەك شوێن کۆ دەبنەوە و بە جۆرێ بە یەکەوە دەنووسێن وەکوو دوورگەیەکی گەورەی ناو ئۆقیانووسیان لیّ دێ و بەمە دەڵێن(دوورگەی مەرجانی).لە عەرەبیدا، مەرجان بە مانای مرواری وردیش هاتووە.
**مەرکەب:** وڵاغی سواری.
**مەزات(مزاد):** لەسەریەك زیاد کردن لە کاتی کڕینی شتی هەڕاجکراو.
**مەزار:** شوێنی سەردان، زیارەتگا، گۆڕ، قسن.
**مەزبەلە:** گووفەك، سەرەنوێلك، زبڵدان.
**مەزرەعە:** شینایی، شوێنی داچێنراو بە تایبەتی بە شتی ئاوییە.
**مەزلووم(مظلوم):** زوڵم لیّ کراو.
**مەسائیل(مسائل)**، کۆی(مسألة)یە: پرس، ئیش و کار.
**مەسروور:** شاد و بەکەیف.
**مەشغووف(مەشغوف):** بەمەراق.
**مەعرەکە:** شەڕ.
**مەعسییەت(معصیة):** تاوان، گوناه.
**مەغشووش:** شتی قەڵپ و ساختە، شتی ناتەواو.
**مەغزووب(مغضوب):** رق لیّ هەستاو.
**مەفاد(مفاد):** کرۆك و ناوەرۆك، سوود.
**مەفتوون:** شەیدا.
**مەقناتیس(المغناطیس):** جۆرە ماددەیەکە کە دوو جەمسەری(+، -)ی هەیە، توانای راکێشانی ئاسنی هەیە.
مەککار(**مکّار**): ئۆینباز، فێڵباز، حیلەباز.
**مەلالەت:** بێزاری، دڵتەنگی، وەڕسی، خەمۆکی، سەخڵەتی.

**مەلجەء**: دالّدە، پەناگە، حەشارگە.
**مەلق:** ریایی، چاپلووسی.
**مەمات:** مردن، مەرگ.
**مەنات(مناة):** بتێ بوو، هەندێ تایفەی عەرەب پێش ئیسلام دەیانپەرست. (ومناة الثالثة الکبری).
**مەندەل:** شارێکە لە هیند، عوودی زۆرە، عوودەکە بە ناوی شارەکە کراوە. عوودەکە خۆی لەسەر خاکی هیند ناڕوێ، لە دوورگەیەکی ئەولای هێلی ناوەڕاست دەڕوێ و ئاو دەیهێنێ.ئەگەر بەتەڕی بیبڕنەوە پێی دەگوترێ(قامرروونی) و ئەگەر بە وشکی لێی بکەنەوە پێی دەگوترێ(مەندەلی).
**مەودا:** رادە، سنوور، دەمی تیغ و شیر.
**مەوسووف(موصوف):** وەسفکراو.
**مەوسیم:** وەرز.
**مەولا(مولی):** خاوەن، سەروەر، دۆست، مەولانا: خاوەن و گەورە و سەروەری ئێمە. زۆرجار وەکو نازناو بەکاردێ: (مەولانا خالید، مەولانا جەلالەدینی رۆمی...).
**موەززین(مؤذن):** بانگدەر.
**موبتەلا:** گرفتار، تووشهاتوو.
**موبین:** ئاشکرا.
**موتەنەففیس:** هەناسەدەر، درکەیە لە مرۆڤ و گیانداری دی بەرامبەر بە خوا کە موتەنەففیس نییە.
((ئەم قەوسە بە دەستی موتەنەففیس نەکشاوە))(نالی).
**موتەهەر(مطهّر):** پاك.
**موتریب:** بەجۆشخەر، سازندە و گۆرانیبێژو سەماکەر.
**موتلەق:** رەها.
**موجیب:** پێویست.
**موخلیس(مخلص):** دڵسۆز، دڵشەوتی، دڵپاك.
**مورسەل:** ناردراو، رەوانە کراو، شاند.
**مورشید:** رێبەر، پێشەوا.
**موزنیب(مذنب):** گوناهبار، کەتنکەر، تاوانبار.

**موژە:** برژانگ، بژانگ، مژۆل، مژگان.
**مژگان:** موژە.
**موسەخخەر(مسخّر):** رام، تەسخیر کراو((سبحان الذی سخّرلنا هذا و ما کنا له مقرنین)).
**موسەللا(مصلّی):** جیٚنویٚژ، نویٚژگا.
**موستەمەند:** بیٚنەوا، بیٚچارە، لیٚقەوماو.
**موشتاق:** پەرۆش.
**موعەتتەر(معطر):** بۆندار، بۆنخۆش.
**موعەللا(معلّی):** هەلّکراو، بەرزکراوە، بلّندکراو.
**موعتەبەر:** بەمتمانە، جیٚبڕوا.
**موعجیزە:** پەرچۆ، کاریٚکی نائاساییە لە دەستووری بە ڕیٚوە چوونی گەردوون بەدەرە. لە پیٚغەمبەرو ئەولیایان روو دەدا تا خەلّك بڕوایان پیٚ بکا.
**موغازە(magazine):** دوکان، فرۆشگا.
**موغلەق:** داخراو، پیٚوەدراو، قەپاتکراو.
**موفتەخیر(مفتخر):** شانازی بەخۆکەر.
**موفتی:** فتوادەر، ئەوەی حوکم لەسەر مەسەلەیەکی ئایینی دەدا.
**موقەددەر(مقدّر):** تەقدیرکراو، چارەنووس.
**موقەووەس(مقوّس):** کەوانەیی، کەوەیی، کووڕ، چەماوە.
**موقەووی(مقوّی):** بەهیٚزکەر، وەجدەر، وزەبەخش.
**موقتەبەس(مقتبس):** شتی وەرگیراو، ڕۆشنایی وەرگیراو.
**موقتەزا(مقتضی):** پیٚویست.
**موقیت(مقیت):** جیٚی رق لیٚ بوونەوە.
**مونەووەر(منوّر):** نوورانی، روناك کراوە.
**مونکیر:** کاری پیس و ناشیرین و ناشەرعی، ناپەسەند، ناڕەوا.ناوی یەکیٚکە لەو دوو فریشتەی دوای مردن و ناشتنی مرۆڤـ لەناو گۆڕ دیٚنە سەری و پرسیاری بیرو باوەڕی ئایینی لیٚ دەکەن(نکیر و منکر).
**موهەییا:** ئامادە، تەیار.
**میحنەت:** مەینەت، ئازار، ناخۆشی، دەردەسەری.
**میسال(مثال):** نموونە، میناك.

**میشکات:** دەلاقەی چرا، هەر شتێ کە چرای لە ناو یان لەسەر دابنرێ.
**میقرۆب**(microbe): زیندەیەکی زۆر زۆر وردە بە چاو نابینرێ، لە هەوادا دەژی و ئەگەر بچێتە ناو لەشی مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەکا.هەرجۆرە میکرۆبێك مرۆڤ تووشی جۆرە نەخۆشییەك دەکا.
**میهتەر:** مەیتەر، سەیس، ئەوەی لە ناو تەویلە خزمەتی ئەسپ دەکا.
**میهنە:** پیشە، کارو کاسبی.

((ن))

**نارین:** جوان، قشت، شەپاڵ.
**ناسیخ:** پووکێنەرەوە، ئەوەی شتی پێش خۆی دەپووکێنێتەوە.ئەو ئایەتەیە لە قورئان کە حوکمی ئایەتێکی پێشوو هەڵدەوەشێنێتەوە.
**نەبات:** گیا، جۆرو شیرینییەکە وەکوو شووشە گەڵاڵە دەکرێ، لەشیلەی شەکر دەردەهێنرێ.
**نەبز (نبض):** لێدانی دڵ، سووسەی دڵ.
**نەجابەت:** نەجیبی، رەسەن و نەژاد پاکی، گەورەیی و پایەداری.
**نەدامەت:** پەشێمانی، پاشگەز بوونەوە.
**نەزارەت (نظارة):** چاودێری، چاو لەرێ بوون، روانین، زیرەکی.
**نەزەرگا:** جێگای سەیرو تەماشا، دیمەن.
**نەزع:** هەڵکەندن، گیاندان، گیانەلا.
**نەزم (نظم):** هۆنراو، رێك و پێك.
**نەسرەت (نصرة):** سەرکەوتن.
**نەسس (نص):** دەق.
**نەسیب (نصیب):** بەش، بەهر.
**نەسل:** نەوە، وەچە، تۆرەمە، زاروزیچ.
**نەسیم:** کزەبا، شنەبا.
**نەشئە:** مەستی، جوانی و ناسکی.
**نەشتەر:** چەقۆی نووك تیژی خوێن بەردان، چەقۆی توێکاری پزیشك.

**نەعلەین(نعلین):** جووتە پێڵاو، جۆرە پێڵاوێکی بێ پاژنە و سەرکورتە بە زۆری پیاوی ئایینی لە پێی دەکەن.
**نەفام:** نەزان، تێنەگەیشتوو.
**نەققاشی ئەزەل:** نیگارکێشی رۆژی بەرێ، مەبەست خوایە.
**نەکبەت:** کارەسات.
**نەکیر:** نکوولی، کاری سەخت و دژوار، (نکیر و منکر) دوو فریشتەن دوای مردن و ناشتنی مرۆڤ لەناو گۆڕ دەچنە سەری و پرسیاری بیروباوەڕی ئایینی لێ دەکەن.
**نەودەم:** تازەدەم، تازە وەخت، تازەپێ راگەیشتوو.
**نەورەسیدە:** نەودەم، تازەپێ راگەیشتوو.
**نوشوور (نشور):** بڵاوکردنەوە، زیندوو کردنەوەی دوای مردن.
**نوبووەت (نبوّت):** پێغەمبەراتی.
**نۆت(bank_note):** پارەی کاغەز، بەنقەنۆت.
**نوتفە (نطفة):** ئاوی پاك و ساف. ئەو ئاوە کەمەی لە بنی دەوڵك یان کوندە دەمێنێتەوە، ئاوی پیاو یان ژن، ئەو زیندە هەرە وردیلەی لە ناو تۆوی پیاودا هەیە و ئاوڵەمەی لێ دروست دەبێ.
**نوتق (نطق):** قسە.
**نووح:** لە تەفسیر و مێژووی ئیسلامدا هاتووە: نووح کوڕی (لمك) کوڕی (متوشلخ) کوڕی (اخنوخ) کوڕی (ادریس) کوڕی (مارد) کوڕی (مهلائیل) کوڕی (قینان) کوڕی (انوش) کوڕی (ثبت) کوڕی ئادەمە. لەتەمەنی (٩٥٠) ساڵیدا و دوای ماوەیەکی زۆر بانگ کردنی خەڵك و خواپەرستی، (٨٠) کەس زیاتر بڕوای پێ نەهێنا، کافرەکان کەڵەوەکێشیان لەگەڵ کرد، خودا تۆفانی نارده سەریان.حەزرەتی نووح کەشتییەکی دروست کردو یاوەرەکانی خۆی و گیان لەبەر و پەلەوەری سوارکردن. کە تۆفان نیشتەوە کەشتییەکەی لەسەر چیای(جودی) لەنگەری گرت (واستوت علی الجودی).
نووح سێ کوڕی هەبوو، پاش تۆفان دونیایان ئاوەدان کردەوە:
حام: زەوی رەشی بەرکەوت:زنج و حەبەشەو بەربەر.
سام: عیراق و خوراسان و حیجاز و یەمەن و شام و ئیران.
یافث: ترك و سقلاب و یاجوج و ماجوج و هەتا چین.
**نیسار(نثار):** پەخش، پەرت، بڵاو.

**نیعمه(نِعْمَ):** وای باشه!! بۆ پیاهەڵدانە، پێچەوانەی (بئس)ەیە. (نعم الولد: کوڕی باشە!).
**نیفاق:** دووڕوویی، دووفاقی.
**نیقاب:** رووبەند، پەچە، رووپۆش.
**نیهایەت:** کۆتایی، دیماهی.
**واعیز(واعظ):** مۆچیار، ئامۆژگاریکەر. لە شیعری کلاسیکی کوردیدا وەکوو پیاوێکی ناپەسەند باسی کراوە چونکە ئامۆژگاری شاعیر دەکا دەست لە یارەکەی هەڵگرێ.
**وەھ:** هۆ، سۆنگە، سەبارەت، ئەگەر.
**وەحدەت:** تاکێتی، یەکبوون.
**وەحشەتکەش:** ئەوەی دەردی تەنیایی و ترس و دڵتەنگی دەکێشێ.
**وەرەع:** خواپەرستی.
**وەرەم:** نەخۆشی سیل، دیق، ئاوسان.
**وەرتە:** فەرشی گەورە و ئەستوور و چاك و بەنرخ.
**وەزیفە(وظیفة):** پیشە، ئەرك.
**وەلەد(ولد):** کوڕ.
**وەلەك:** بەعەرەبی عامی بە مانای(کورە) دێ.
**ولکە:** زەوی، نیشتمان، خاك، کیشوەر.
**ویفق:** لە گۆر، بەگوێرەی، بە پێی.
**وێڵ:** گومڕا، سەرگەردان.

((ھ))

**هەمجەلیس:** هەمنشین.
**هومایی:** خۆشبەختی، نیسبەتە بۆ (هوما) کە باڵندەیەکە سێبەری بکەوێتە سەر هەرکەسێ بەختەوەری دەکا.
**هوەیدا:** ئاشکرا، بەرچاو.
**هیجر:** کۆچ، مشەخت.

((ی))

**یاساغ:** قەدەغە.
**یەدی بەیزا(الید البیضاء):** دەستی سپی. یەکێ بووە لە موعجیزەکانی حەزرەتی مووسا کە دەستی لە گیرفانی دەنا و دەری دەهێنا سپی دەینواند. درکەیە لە هێزو توانا.
**یەسریب (یثرب):** ناوی کۆنی شاری (مەدینە) بووە.
**یەغما:** تالاّن، چەپاو.
**یەکدانە:** دوڕی یەکدانە دوڕێکی گەورەیە بەتەنیا لەناو یەك قەپێك (صدف)دا پەیدا دەبێ.
**یەم:** دەریا.
**یوسر(یسر):** فەڕەحنایی، خۆشی.
**یومن:** خۆشبەختی، بەرەکەت.
**یێقەگیر:** یاخەگر، بە رۆکگیر.

# پێڕست


پێــشەکی ........................ ٧
غــەزەل ........................ ١٣
قەسـیدە ........................ ٧٣
پێنجینەبەنـد ........................ ٢٦٧
پێنج خشتەکی ........................ ٣١٩
مەســــــنەوی ........................ ٣٦٣
چوارین و تاکـەدێڕ ........................ ٣٧٣
قسمت فارسـی ........................ ٣٧٩
القـسم العربـی ........................ ٤٤٥
فەرهــەنگۆك ........................ ٤٥١